ليۆ تۆلستۆی

# حاجی مراد

ڕۆمان

وەرگێڕانی
ئەمین گەردیگلانی




## خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

- **حاجی مراد**
- **نووسینی:** لیۆ تۆلستۆی
- **وەرگێڕانی:** ئەمین گەردیگلانی
- **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال رواندزی
- **بەرگ:** رێمان
- **پیتچنین:** ئەوین سلێمان جیهان
- **نرخ:**٤٠٠٠ دینار
- **چاپی یەکەم ٢٠١٤**
- **تیراژ:** ١٠٠٠ دانە
- **چاپخانەی** موکریانی (هەولێر)
- بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەی گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٢٥٧) ساڵی ٢٠١٤ی پێی دراوە.

**زنجیرەی کتێب (٨١٩)**





ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

له مەزراوە دەگەڕامەوە بۆ ماڵێ. دوایین مانگی بەهار بوو. وەرزێڕەکان گیای مێرگ و چێنکانیان دوریبۆوە. جۆ زەرد بووبوو. لەو کاتەی ساڵدا، بۆنی خەرمانی گوڵی پەمەیی و سپی و سووری سێوەڕە وڵاتی داگرتبوو. بێژان و زڕەمەندێ بەرامەیان دەڕشت و گوڵی بەیبوون و شیروشەپاڵ بە پەلکی سپی و نێوەڕاستی زەردەوە بۆنی خۆشی بەهاراتیان بڵاو دەکردەوە. بنجی گوڵەباخ بەرامەی خۆشیان ئاوێتەی هەوا دەکرد و هەنگ بۆ کۆکردنەوەی هەڵاڵە وەخۆ کەوتبوون.

شلێرەی زەرد و سوور، گەش و پاراو، بە باڵای بەرزەوە سەریان بۆ خاک دانەواندبوو. ڕکێشە بە گەڵای پان و تەڕوبڕەوە تازە خەریک بوو گوڵی دەکرد. چرۆی مەیلەوبنەوشی گەرمەشانی تازە خەریک بوو دەپشکوتن و کاکۆڵی نەرم و تەڕیان لە بەر تیشکی خۆری بەیانیان مەیلەوشینی دەنواند و لای عەسر سیس دەبوون و هەڵدەپڕووزان. گوڵی هەنجیری کە بۆنی بادامیان لێدەهات. وەک زمڕوود دەدرەوشانەوە.

چەپکێ گوڵی ڕەنگاوڕەنگم چنی و بەرە و ماڵی ملی ڕێم گرت. لە ناکاو لە کەناری ڕێگاکە و لە قووڵکەیەکدا گوڵە کەنگرێکی پەمەیی تازە پشکووتوو، سەرنجی ڕاکێشام. لەو جۆرە بوو کە لای خۆمان پێی دەڵێن قانگەلاشک. کاتی دروێنە، دروێنەوان بە پارێزەوە بە پاڵیدا

تێدەپەڕێ و کاتێک دەکەوێتە بەرداسەکەی، لە بندا دەیپەڕێنێ و تووڕی هەڵدەدا، نەوەک دڕکەکەی بە دەستیدا بچێ. هاتمە سەر ئەوەی هەڵیبکەنم و بیخەمە نێوەڕاستی چەپکە گوڵەکەمەوە. لە ڕێگاکە کلابووم و چوومە نێو قوولکەکەوە. مێشەنگوینێک بە گوڵەکەیەوە نیشتبوو و دەتگوت خەوی لێکەوتووە، هەڵمفڕاند. ویستم گوڵەکەی بچنم. زۆر کارێکی دژوار بوو. دەسرەیەکیشم لە دەستم پێچا بەڵام هەموو پشتی دەستم ڕووشا. نزیکەی پێنج خولەکی خایاند هەتا گوڵی کەنگرەکەم چنی. دەبوو گەڵا دڕکاوییەکانی دانە بە دانە لێ بکەمەوە. ساقەتەکەی ڕیشاڵڕیشاڵ بووبوو. کاتێک قرتاندم ئیتر ڕەنگ و گەشاوەییەکەی لە دەست دابوو، جگە لەوەش دوای چنینەکەی بۆم دەرکەوت بە هۆی شەقوڕەق بوونی دڕکەکانییەوە لە نێو چەپکە گوڵەکەدا جێی نابێتەوە و لەگەڵیان ناسازی. بە ناچاری فڕێم دا. خەم دایگرتم و لە دڵی خۆمدا گوتم بۆچی ئەو گوڵە جوانەم لە نێو برد کە لە جێگای خۆی ئەو هەمووە جوان و سەرنجڕاکێش بوو؟

وەبیرم هاتەوە بە چ زەحمەتێک چنیبووم و چەندەی خۆڕاگری کرد و بەرەڤانیی لە خۆی کرد. ڕێگاکەم بە نێو مەزرایەکی گڵەڕەشەدا دەڕۆیشت کە تازە کێڵابوویان. کێڵگەکە ملکی جووتیارێکی گەورە بوو کە زەویی هەر دوو بەری ڕێگاکە هی ئەو بوو. زۆر باش زەوییەکەیان کێڵابوو. تەنانەت تاقە لقێک ڕووەک نەمابۆوە و هەمووی خاشەبڕ کرابوو؛ بیرم کردەوە مرۆڤ چەندە بوونەوەرێکی خراپکارە. بۆ تێر کردنی ورگی خۆی بەزەیی بە ژیانی هیچ ڕووەک و ئاژەڵێکدا نایە. بێ ئیختیار چاوم لە دەوروبەری خۆم دەکرد بەڵکوو ئاسەواری گیایەک لە نێو ئەو کاتۆرە کێڵدراوەدا بدۆزمەوە. بستوویەک لای ڕاستی جادەکە هەڵکەوتبوو. لێی نزیک بوومەوە. چاوم بەو جۆرە

کەنگرە کەوت کە تاوێک لەمەوبەر لە نێوم بردبوو. بەڵام ئەمەیان سێ گوڵی پێوە بوو. یەکیان لە نێو قەددا شکابۆوە. وەک چۆکی شکاوی مرۆڤ وابوو کە دەنووشتێتەوە. گوڵەکەی دیکەشی شکابۆوە و سیس هەڵگەڕابوو و ملی بە لارەوە نابوو. لقی سێهەمیش، لەگەڵ ئەوەشدا بریندار و قوڕاوی بوو، بەڵام هێشتا ڕاست چەقیبوو. وێدەچوو تایەی عارەبانە بە سەریدا تیپەڕیبێ و شکاندبێتیەوە، بەڵام سەر لە نوێ هەستابۆوە. بەرەو لایەک خوار بووبۆوە. هەموو تەڕایی و شیرەکەی هاتبووەدەرێ. دەستێکی قرتابوو و چاوێکی دەرپەڕیبوو. لەگەڵ ئەوەشدا بە هێز و خۆڕاگر ڕاوەستا بوو. تەسیلمی ئەو مرۆڤانە نەدەبوو کە براکانی ئەویان لە نێو بردبوو... لە دڵی خۆمدا گوتم ئەوەیە هیوادار بوون بە ژیان و زیندوومانەوە. مرۆڤ دەستی بە سەر هەموو شوێنێکدا گرتووە و سەدان میلیۆن گیای لە نێو بردووە، بەڵام ئەمەیان هێشتا زیندووە و خۆی بە دەستەوە نەداوە.

قەفقازم وەبیر هاتەوە کە چەند ساڵ لەمەوبەر لەوێ بووم؛ سەردەمێک کە بەشێکی ئەو وڵاتەم بە چاوی خۆم دیتبوو و زۆر شتیشم لە بارەیەوە بیستبوو؛ پاشماوەکەشی دەمتوانی بیهێنمە بەر چاوی خۆم و هەستی پێ بکەم. ئەو بەشەی کە لە بیرم بوو و دەهاتەوە بەر چاوم بەم شێوەیە بوو:

## یەک

کۆتایی ساڵی 1851 بوو، ئێوارەیەکی ساردی سەرماوەز. حاجی مراد بە سواری ئەسپ گەیشتە گوندی مەخمێت[1] کە لە ژێر دەسەڵاتی چیچینییە شەڕەنگێزەکاندا بوو و پازدە میل لەو ناوچانە دوور بوو کە لە ژێر دەسەڵاتی ڕووسەکاندا بوو. بۆنی دووکەڵی کزیاک[2] پانتای گوندەکەی داگرتبوو. بانگی شێوانی دابوو. بۆڕەی گاڕان و باڕەی مێگەل کە بەرە و گوندەکە دەگەڕانەوە، لەگەڵ دەنگ و ویرەویری گوندنشینەکان تێکەڵ بووبوو. لەلای کانیاوەکەشەوە دەنگی ژنان و منداڵان دەهاتە گوێ.

حاجی مراد جێگری شامیل[3] بوو. باسی بە جەرگی و ئازایەتیی ئەو لە وڵاتدا دەنگی دابۆوە. هیچ کات بە بێ ئاڵا و بەبێ هاوڕێیەتیی گوروویێک لە هاوڕێکانی خۆی کە لە پێش ئەوەوە دەڕۆیشتن، ڕووی نەدەکردە شوێنێک. بەڵام ئێستا وەک ئاوارەیەک تەنیا کەوتبوو و تەنیا هاوڕێیەک لەگەڵیدا بوو، مێزەری زەردی بە سەرەوە و کەرکەیەکیشی بە شانیدا دابوو تفەنگەکەی لە ژێریدا وەدیار کەوتبوو. نەیدەویست بکەوێتە بەر چاو. بە چاوە ڕەشەکانی هەموو ئەو کەسانەی دەخستە ژێر چاوەدێری کە دەهاتنە سەر ڕێگاکەی.

---

1- Makhmet

2- Kizyak ناوی ناوچەیی تەپاڵە، دەوە.

3- Shamil

کاتێک گەیشتە گوندەکە، بە جێی ئەوەی ڕاست بڕوا بۆ گۆڕەپانی گشـتی، بە دەسـتە چەپـدا لایـدا و خـۆی کـرد بە کـۆلانێکی باریکـدا. گەیشـتە بەر دەرگـای مـاڵی دووهەم، مـاڵەکە لە کێویـک دا بـڕا بـوو، ڕاوەسـتا و چـاوی لە دەوروبەری خـۆی کـرد. بەر دەرگـای مـاڵەکە کەسی لێ نەبوو، بەلام پیاوێک کەڵپۆسێکی بە سـەری خۆیدا ابو و لە سەربانی ماڵەکە خەوتبوو. سەربانەکە تازە سواغ درابوو. حاجی مراد بە دەسکی خەرەزەنەکەی لە شانی پیاوەکەی کوتا. پیرەپیاوێک لە ژێر کەڵپۆسەکە هاتە دەرێ. پێڵووی چاوی خەم تێزاوی پیرەپیاو مژۆڵـی نەبوو. چاوی هەڵگولۆفی بۆ ئەوەی بتوانێ هەڵیبێنێ.

حـاجی مـراد لـۆی مێـزەرکەی لە سـەر دەموچـاوی لابـرد و گـوتی سـلاوموعلێکم» پیـرە پیـاوکە ناسـییەوە وەلامـی دایەوە عەلەیکمەسـەلام». زەدەیەکـی گـرت. هەسـتا لە سـەر لاقە لاوازەکـانی ڕاوەستا. شەڕواڵەکەی لەپێکرد. پاشان بەشێنەیی دەستی کرد بە نێو کەلپوسـەکەیدا. پاشـەوپاش بە نێردیوانێکـدا هـاتە خـواری کە بە دیـوارەکەوە هەڵپەسـێردرابوو. بە دەم هـاتنە خوارێـوە خـۆی پۆشـتە کـردەوە. بە دەمە بێ ددانەکەی لە ژێـر لێوەوە شـتێکی گـوت. هەر کە پێی نایە سەر زەوی بۆ ڕێز گرتن چوو ڕکێفەکەی حـاجی مـراد بگرێ بۆ ئەوەی دابەزێ. بەلام هاوڕێکەی حاجی مراد بە پەلە لە ئەسـپەکەی دابەزی و خـۆی گەیانـدە ڕکـێفەکە و پیرەپیـاوی خسـتە ئەو لاوە و خۆی جێگاکەی گرتەوە.

حـاجی مـراد دابەزی. تـۆزێ دەشـەلی. بەرە و دەرگـانەی مـاڵەکە وەڕێ کەوت. کوڕێکی پازدە سـالان بە پەلە لە دەرگاکە هـاتە دەرێ و چـاوی لە دەموچـاوی پیـاوی تـازە هـاتوو بـڕی. پیرەپیـاو پێـی گـوتی:

«بڕۆ بۆ مزگەوت باوکت ئاگادارکە.» خۆشی بە هەڵەداوان چوو دەرگای باریکی ماڵەکە بکاتەوە.

حاجی مراد چووە ژووریّ. ژنێکی گەڕاوە کە کراسێکی زەرد و فش و کلۆنجەیەکی سوور و دەرپییەکی فشوفۆڵی لە پێدا بوو، چەند بالیفی بە باوەشەوە، لە ژوورکەی پشتەوە هاتەدەریّ و گوتی بەخێربێن، خێر و بەرەکەتتان هێنا.» بالیفەکانی لە بن دیوارەکە دانا بۆ ئەوەی میوانەکان پاڵی پێوەدەن. حاجی مراد لەگەڵ ئەوەی کەرکە و تفەنگ و شمشێرەکەی دەدایە دەستی پیرەپیاو گوتی خودا دەست بە عومری منداڵەکانت بگریّ.»

پیرەپیاو تفەنگ و شمشێرەکەی بەو سنگەدا هەڵواسی کە تفەنگی خاوەنماڵی پێدا هەڵواسرا بوو. سنگەکە لە نێوان دوو کاسەی دەستشۆریدا داکوترا بوو کە دیوارەکەی تازە سپیکاری کرا بوو. حاجی مراد پشتێنەکەی ڕێکوپێک کرد. لە بن دیوارەکە دانیشت و پاڵی بە بالیفەکانەوە دا. پیرەپیاو بە پای پەتی و بیّ گۆرەوی لە پاڵ ئەودا لە سەر چۆک دانیشت. چاوی قووچاند و دەستی بۆ ئاسمان هەڵبڕی. حاجی مرادیش وای کرد. دوای دۆعا و نزا دەستیان بە دەموچاویاندا هێنا و کێشایانە خواریّ هەتا گەیشتە نووکی ڕیشیان.

حاجی مراد لە پیرەپیاوی پرسی: «خەبەر و باس چییە؟»

پیرەپیاو وەڵامی دایەوە: «خەبەر یۆخ[٤].»

بە جێی ئەوەی چاو لە چاوی حاجی مراد بکات چاوی لە سینگی ئەو دەکرد. حاجی مراد تێگەیشت کە پیرەپیاو نایهەویّ ئەوەی دەیزانیّ بۆی باس بکات. تۆزیّ سەری لەقاند و ئیتر هیچی نەگوت.

---

٤- هیچ خەبەرێک نییە.

پیرەپیاو گوتی: «خەبەری باش نییە. یەکێک لە خەبەرەکان ئەوەیە کەرویێشکەکان خەریکی ڕاویێژن بۆ ئەوەی چۆن هەڵۆکان لە خۆیان بتارێنن؛ هەڵۆکانیش سەرەتا ئەمیان دەخۆن و پاشان ئەوی تریان. چەند ڕۆژ لەمەوبەر ڕووسەکان گوندی میتغیتیان ئاور تێبەردا. خودا غەزەبیان لێگرێ و لەتوکوتیان کا!»

هاوڕێکەی حاجی مراد هاتە ژووریێ و بە هەنگاوە بە هێزەکەی بە نێو ژوورەکەدا تێپەڕی. لۆی مێزەرەکەی لە سەر دەموچاوی لابرد، ئەویش وەک حاجی مراد تفەنگ و شمشێرەکەی بە سنگەکەدا هەڵواسی و خەنجەر و پشتێنەکەی ڕاستەوپاستە کرد.

حاجی مراد گوتی: « ئەمە ئیلداری هاوڕێمە.»

پیرەپیاو گوتی: «زۆر باشە بە خێر بێ.» هەر لەسەر ئەو لمەدەی حاجی مراد دانیشتبوو، جێگایەکی پیشان ئیلداریش دا دانیشێ. ئیلدار نەچووە سەر لمەدەکە و لەو لاوە چوارمەشقی دانیشت و چاوی لە چاوی پیرەپیاو بڕی. پیرەپیاو بۆی باس کردن کە حەوتووی ڕابردوو چۆن دوو لاوی بە جەرگی گوندەکەیان دوو سەربازی ڕووسییان گرتووە و یەکیان سەر بڕیوە و ئەوەی دیکەیان ڕادەستی شامیل کردووە.

حاجی مراد هۆش و خەیاڵی لە شوێنێکی تر بوو. چاوی لە دەرگاکە دەکرد و گوێی بۆ دەنگەکانی دەرەوە شل کردبوو. لە دەرەوە ترپەی پێ دەهات. تەقەی دەرگاکە هات. سادۆ[5]ی خاوەنماڵ هاتە ژووریێ. چل ساڵی تەمەن بوو و ڕیشێکی قولە و لووتێکی درێژی هەبوو. ئەویش چاوی ڕەش بوو بەڵام وەک چاوی کوڕە

---

5- Sado

پازده ساڵانەکەی کە چوو بوو باوکی بانگ بکات بریقەی نەدەهات. کوڕەکە لەگەڵ باوکی هاتبووە ژووری، لە پەنای دەرگاکەدا دانیشت. خاوەنماڵ کەوشە دارینەکانی داکەند. کڵاوە کۆنەکەی لە سەر نێو چاوانی هەڵکێشا و بەرەوڕووی حاجی مراد لە سەر چۆک دانیشت.

ئەویش وەک باوکی دەستی بۆ نزا هەڵبڕی و دوای هێندێ ورتە ورت دەستی بە دەموچاو و ڕیشیدا هێنا و گوتی شامیل فەرمانی داوە حاجی مراد مردوو یان زیندوو دەستگیر بکەن و ڕادەستی ئەوی بکەن. نوێنەرەکەی شامیل ڕۆژی ڕابردوو لەو گوندە ڕۆیشتبوو. خەڵکی نەیاندە وێرا فەرمانی شامیل جێبەجێ نەکەن و لە قسەی دەرچن. گوتی: «دەبێ زۆر بە پارێزەوە هاتوچۆ بکەن و ئاگاتان لە خۆتان بێ، ئەگەرچی لەمماڵەدا هیچ کەس ناوێرێ سووکایەتی بە میوانم بکات، بەڵام لە دەرەوە نازانم چی ڕوودەدا. دەبێ بیری لێ بکەینەوە.

حاجی مراد بە وردی گوێی بۆ قسەکانی ڕاگرتبوو. سەری دەلەقاند. کە سادۆ بێدەنگ بوو، گوتی: «گرینگ نییە، زۆر خۆتان سەغڵەت مەکەن. بە پێویستی دەزانم کەسێک بە نامەیەکەوە بنێرم بۆ لای ڕووسەکان. ئیلداری هاوڕێم دەچێ بەڵام دەبێ ڕێنوێنێکی لەگەڵدابێ.»

سادۆ گوتی: «باتا[6]ی برامی لەگەڵ دەنێرم.» ڕووی لە کوڕەکەی کرد و گوتی: «بچۆ باتا بانگ کە.»

کوڕە وەک تێسکەی تفەنگ لە جێی خۆی دەرپەڕی. قۆڵی ڕاوەشاند و لە دەرگاکە چووە دەرێ. دوای دە خولەک لەگەڵ

---

6- Bata

چێچێنییەکـی بەلەبـاریکە و قـاچ قـوڵە هـاتە ژووریٚ کە دەموچـاوە تاوەسـووتەکەی وەک خەڵـووز ڕەش داگەڕابـوو. جلـوبەرگی کـۆنە و سەر قۆڵ دڕاوی لە بەر دا و پاپۆشـێکی کۆن و شـەقیلە بەستووی لە پێدا بوو.

حاجی مراد بە خێرهـاتنی پێگوت و بیٚ ئەوەی کـات بە فێرۆ بدات لێی پرسی: «دەتوانی ئەو هـاوڕێیەی مـن ڕێنـوێنی بکەی و بیگەیەنییە لای ڕووسەکان؟

باتـا بـزەیەک نیشـتە سـەر لێوی و وەڵامـی دایەوە: «بەڵـیٚ قوربـان دەتـوانم. هـیچ چێچێنیـیەک نیـیە وەک مـن شـارەزای ئەو نـاوچەیە بیٚ. کەسـانی تـر ڕەنـگە هەزار جـۆر قەرار و مەدار دانـێن و شـاتوشـووت بـکەن، بەڵام هـیچ کارێکیـان لە دەسـت نـایە؛ بەڵام مـن ئەوەی دەیڵـێم دەیکەم و ئەگەر سەرم دانابیٚ پاشگەز نابمەوە.»

حـاجی مـراد گـوتی: «زۆر باشـە، سـیٚ ڕۆبـڵ بـۆ زەحمەتـانەکەت وەردەگری.»

باتا بە نیشـانەی حـاڵی بوون سـەری لەقاند و گوتی بۆ پارە کـار ناکـات. هەر ئەوەی بتـوانیٚ خزمەتێک بە حـاجی مـراد بکـات ئەو پەڕی شـانازییە بۆی. چـونکە لەو کوێسـتانە هـیچکەس نییە باسـی ئـازایی و قارەمـانێتیی حـاجی مـرادی نەبیسـتبیٚ و نەزانـیٚ چـۆن کونەمشـکی لە ڕووسەکان کردۆتە قەیسەری.

حاجی مراد گوتی: «گوریس دەبیٚ درێژ بیٚ و قسەش کورت.»

باتا لە وەڵامدا گوتی: «بە چاوان گەورەم، ئیتر زمانم ناگەڕیٚ.»

حاجی مراد گوتیشی: «لەو شوێنەی کە ڕووباری ئارگۆن[7]بە پاڵ ڕەوەزە بەردەکاندا دەڕوا، ڕێگایەک هەیە بۆ نێو لێڕەوارەکە و دوو بستووی لێیە، دەزانی لە کوێیە؟
«بەڵێ دەزانم»
«چوار ئەسپ سوار لەوێ چاوەڕوانی منن.»
باتا سەری لەقاند یانی تێگەیشتووە.
«لەو سوارانە سۆراخی خان محەممەد بگرە. ئەو دەزانێ چی بکات و چی بە ڕووسەکان بڵێ. دەتوانی ئەو ببەی بۆ لای فەرماندەی ڕووسەکان، شازادە ڤۆرۆنتسۆڤ[8] و بیهێنیەوە؟»
«بەڵێ گەورەم دەتوانم.»
« خان محەممەد ببە بۆ ئەوێ و بیهێنەوە، هەتا ئەو کاتە من لە لێڕەوارەکە دەبم.»
باتا دەستی لە سەر سنیگی دانا و گوتی: «بە چاوان گەورەم.»
حاجی مراد ڕووی لە خاونماڵ کرد و گوتی: «دەبێ کەسێکیش بنێرین بۆ گێخی[9].» دەستی کرد بە گیرفانە فیشەکی فانیلەکەیدا، بەڵام کە دیتی دوو ژن هاتنە ژووری، دەستی دەرهێنایەوە.
ئەو ژنانە یەکیان هاوسەری خاونماڵەکە بوو، هەر ئەو ژنە گەڕاوەی کە بالیفەکانی هێنا بوو و بۆی دانا بوون، ئەوی دیکەشیان کچێکی عازەب بوو پانتۆڵێکی زەرد و سیخمەیەکی سەوزی لە بەردا بوو. ملوانکەیەکی دراوی زێو سینگ و بەرۆکی داپۆشیبوو. دوو دراوی زێوینی زۆبلیش بە سەری هەر دوو پەلکە ڕەشەکەیەوە

---

7- Argon
8- Vorontsov
9- Chekhi ناوی شوێنێکە.

هەڵواسرا بوو. چاوی ئەویش وەک هی باوک و براکەی ڕەش بوو، ترووسکەیان دەهات و دەموچاوە جوانەکەی سەرنجڕاکێشتر کردبوو. جۆرێک هەڵسوکەوتی دەکرد دەتگوت میوانەکان نابینێ بەڵام هەست بە بوونیان دەکات. ژنەکەی سادۆ مێزێکی چکۆڵەی گردی هێنا کە چایی و کولێرە و نان و هەنگوین و قەیماخی لە سەر بوو. کچەش ئەفتاوە و لەگانێکی هێنا بوو.

هەتا ئەو کاتەی ژنەکان لە ژوورەکەدا بوون و خرینگەی دراو و زێو و زەمبەریان دەهات و خەریکی چنینی سفرە و خوانە کە بوون، حاجی مراد و سادۆ قسەیان نەکرد. لە تەواوی ئەو ماوەیەشدا ئیلدار وەک پەیکەرە ویشک بووبوو و چاوی لە ئەژنۆی خۆی بڕیبوو. کاتێک ئافرەتەکان لە ژوورەکە چوونە دەرێ و ئیتر ترپەی پێشیان نەدەهات، هەناسەیەکی ئاسوودەی هەڵکێشا.

حاجی مراد فیشەکێکی لە فیشەکدانەکەی دەرهێنا، لە ژێر ئەو نووسراوەیەکی هێنا دەرێ و دای بە سادۆ و گوتی: «ئەوە بدە بە کوڕەکەم.»

«وەڵامەکەی بنێرم بۆ کوێ؟»

«لە لای خۆت بێ هەتا کەسێک هەڵدەکەوێ و بۆم دەنێری.»

«بە چاوان.»

سادۆ نامەکەی نایە نێو فیشەکدانەکەی خۆیەوە. پاشان ئەفتاوە و لەگانەکەی برد بۆ بەر دەستی حاجی مراد. حاجی مراد قۆڵی هەڵکرد. سادۆ ئاوی ساردی کرد بە دەستیدا و دەست و پلی شۆرد، بە خاولی وشکی کردەوە و چوو بۆ لای مێزی خواردنەکە. ئیلداریش هەر وای کرد. هەتا ئەو کاتەی میوانەکان خەریکی خواردن بوون، سادۆ بێدەنگ دانیشت و لەوەی کە گەورەیان کردووە و ڕوویان لە

ماڵەکەی ئەو کردووە زۆر دڵخۆش بوو. کوڕەکەی سادۆ هەروا لە پاڵ دەرگاکەدا دانیشتبوو و چاوی لە حاجی مراد بڕیبوو و بە بزەیەکەوە لە دڵی خۆیدا قسەکانی باوکی پەسند دەکرد.

حاجی مراد سەرەڕای ئەوەی بیست و چوار سەعات بوو هیچی نەخوارد بوو، بە تۆزێ نان و پەنیر قەناعەتی کرد. لە ژێر خەنجەرەکەیدا چەقۆیەکی چکۆڵەی دەرهێنا؛ تۆزێ هەنگوینی بە پەنچکێ ناندا ساوی و خواردی. پیرەپیاو کە دیتی حاجی مراد لە هەنگوینەکەی ئەو دەخوا زۆری پێخۆش بوو و گوتی: «ئەمساڵ لە هەموو ساڵێک هەنگوین زیاترە.»

حاجی مراد سپاسی کرد و دەستی لە خواردن کێشایەوە. ئیلدار ئەگەر چی هێشتا تێری نەخوارد بوو، چاوی لە سەرکردەکەی کرد و ئەویش کشایە دواوە. ئەفتاوە و لەگانەکەیان دیسان هێنایەوە پێشێ و دەستیان شۆرد.

سادۆ دەیزانی ئەو میوانداریيە بۆ ئەو چەندە مەترسیدارە. شامیل ڕایگەیاندبوو هەر چێچینییەک حاجی مراد پەنا بدا و میوانداریی لێ بکات، سزاکەی مەرگە. بەڵام سادۆ نەک ترسی لەو میوانداریيە نەبوو، بەڵکوو زۆریش شانازی پێوەدەکرد کە میوانێکی ئاوا جوامێر و قارەمانی هەیە. بە ئەرکی سەر شانی خۆی دەزانی خزمەت بەو میوانە خۆشەویستە بکات و لەوەی کە توانیبووی ئەو خزمەتە چکۆڵەی پێ بکات هەستی بە شادی و سەر بەرزی دەکرد.

بە حاجی مرادی گوت: «هەتا ئەو کاتەی لە ماڵەکەی مندای و من هەناسە دەکێشم، دڵنیا و ئەرخەیان بە.» حاجی مراد چاوی لە چاوی پڕ ترووسکەی سادۆ بڕی و بە ویقارەوە گوتی: «خودا ئاگاداری خۆت و بنەماڵەکەت بێ و ماڵت ئاوەدان بێ.»

سادۆ بەو دۆعایەی حاجی مراد گەشایەوە و شادی لە دڵی گەڕا. بە نیشانەی سپاس کردن دەستی لە سەر سنیگی دانا. هێندێ ئێزنگی خستە نێو سۆباکەوە و ڕۆیشت بۆ ئەو ژوورەی کە ژن و منداڵەکەی لەوێ بوون و دەرگاکەی پێوەدا. ژنەکان هێشتا نەخەوتبوون. باسی ئەو میوانە مەترسیدارەیان دەکرد کە شەوێ لە ماڵی ئەوان دەمێنێتەوە.

## دوو

له ڤۆزدڤیژنسک[10]، نزیکترین قەڵای ڕووسەکان، کە تەنیا دە میل لەو گوندە دوور بوو کە حاجی مراد شەوێ لێی مابۆوە، سێ سەرباز و ئەفسەرێک لە قەڵاکە هاتنە دەرێ و بەرەو ئەو لای دەروازەی شاهگرینسک[11] وەڕێ کەوتن. سەربازەکان وەک سەربازانی قەفقازی ئەو سەردەمە جلوبەرگیان پۆشیبوو: کوڵەباڵی کەڵپۆس، کڵێتەی پێستە و جزەمەی مل درێژ کە هەتا چۆکیان دەهات. پاڵتۆکەیان توند لە خۆیان پێچابوو. چەکیان لە شان کرد بوو. سەرەتا، نزیکەی پێنجسەد مەتریان ڕێگاکە بڕی. پاشان بیست مەتر بەلای ڕاستدا لە جادەکە لایان دا. گەڵای دارەکان لە ژێر پێیاندا خشەی دەهات. کاتێک گەیشتنە ساقەتەی نیوە سووتاوی چنارێکی شکاو کە لە تاریکییەکەدا دیار بوو، ڕاوەستان. زیاتر لە پەنای ئەو دارە بۆسەیان دەنایەوە.

ئەستێرەکان کاتی هەنگاو نانی سەربازەکان بە نێو دارستانەکەدا، دەتگوت بە سەر دارەکاندا دەخوشێن، بەڵام لە جێی خۆیان چەقیبوون و لە نێو لق و پەلی ڕووتی دارەکانەوە دەدرەوشانەوە.

ملازم پانۆڤ[12] تفەنگ و سەرنێزەکەی لە شانی داگرت و پاڵی بە دارچنارەکەوەدا. سێ سەربازەکەش هەر وایان کرد.

---

10- Vozdvizhensk
11- Shahgirinsk
12- Panov

پانۆڤ بە نیگەرانییەوە گوتی: «ڕەنگە لێم بەجێمابێ یان لە ڕێگا لێم کەوتووە.»

یەکێک لە سەربازەکان بە دەنگێکی گەرم و بە گوڕ گوتی: «لە چی دەگەڕێی؟»

«سەرە قەننەکەم، نازانم چیی لێهاتووە.»

هەر ئەو سەربازە لێی پرسی: «باسقەننەکەت پێیە؟»

«ئەری پێمە.»

«دەی بۆ لە قوولکەیەکدا جێبەجێی ناکەی؟»

«بایی زەحمەتەکەی نییە.»

«هەر ئێستا لە چاوترووکانێکدا جێبەجێی دەکەم.

کێشانی قەننە و جگەرە لە کاتی کەمین داناندا قەدەغە بوو، بەڵام ئەم کارەی ئەوان تەنیا ناوی کەمین بوو. پۆستێک بوو لەو پێشەوە، نەوەک شۆرشگێڕانی شاخ تۆپێک بێننە پێشێ و وەک هەمیشە بە قەلاکەیەوە بنێن. پانۆڤ بە پێویستی نەدەزانی چاوپۆشی لەو چێژەی کێشانی دووکەڵ بکات. پێشنیاری سەربازەکەی قەبووڵ کرد. سەربازەکە چەقۆیەکی لە گیرفانی دەرهێنا و قوولگەیەکی خڕ و چکۆڵەی لە سەر عەرزی دروست کرد. لە پەنای قوولگەکە کونێکی چکۆڵەی ساز کرد و باسقەننەکەی پێدا کرد. قوولکە چکۆڵەکەی پڕ کرد لە تووتن و دایشێلا، قەننەی ئامادە کرد. شقارتەکەی هەڵکرد. بۆچرکەیەک دەموچاوی قەلەوی ئەو سەربازە ڕووناک بۆوە کە لە سەر زگ ڕاکشا بوو. تووتنەکە گرتی و سەربازەکە مژی لێدا، دوای چرکەیەک پانۆڤ بۆنی تووتنی هەڵمژی.

«ئامادە بوو؟»

«بەڵێ، فەرموو.»

«ئاڤـدێڤ[13]، بەڕاسـتی زیـرەک و لێزانـی! لە حـاکمی شـەرعیش زاناتری! دا لاچۆ با مژێکی لێدەم.»

ئاڤـدێڤ چـووە ئەو لاوە. جێگـاکەی دا بە پـانۆڤ و دووکەڵ لە دەمیـیەوە هـاتە دەرێ. پـانۆڤ لە سـەرزگ ڕاکشـا، بە سـەر قـۆڵی چاکەتەکەی جێی دەمەکەی ئاڤدێڤی سڕی و مژێکی لێدا، دووکەڵ لە زارییەوە دەرچـوو. دوای ئەوەی هەموویـان بە نـۆرە قەننەیـان کێشـا، کەوتنە قسە کردن.

یەکێک لە سـەربازەکان بە دەنگێکی خەواڵووەوە گوتی: «دیسـان فەرماندەر دەستی گەیاندۆتە سندووقی پارەی سندووقەکە. لە قوماردا دۆڕاندوویەیە.

پانۆڤ گوتی: «حەتمەن دەیخاتەوە جێی خۆی.»

ئاڤـدێڤ بە دڵنیـاییەوە گـوت: «حەتـمەن دایـدەنێتەوە، زۆر ئەفسەرێکی باش و ڕاستە.»

ئەو سەربازەی قسەکەی دامەزراندبوو گوتی: «باشـە! وایە! منیش دەڵـێم ئەفسـەرێکی پـاک و ڕاسـتە، بەڵام دەبـێ قسـەی لەگەڵ بکەیـن. ئەگەر کەسـێک پـارە لە سـندووقەکە هەڵـدەگرێ دەبـێ بڵـێ چەنـدەی هەڵگرتووە و کەنگێ دەیخاتەوە سەر جێی خۆی.»

پـانۆڤ کە قەنـنەکەی کێشـابوو، گـوتی: «بڕیـاری ئەو کـارە بە ئەستۆی فەرماندرە.»

ئاڤـدیڤ گـوتی وایە لە خـۆڕا نـاڵێن: «دەسـەڵات بە دەسـت فەرماندەرە.»

---

13- Avdiev

ئەو سـەربازەی کە لەو کـارە نـاڕازی بـوو، پێـداگریی دەکـرد کە بەهاریٚ دەبیٚ پۆستاڵ و جۆ بکڕن. ئەگەر پارەکان بخۆن هیچیان پیٚ ناکریٚ.

پـانۆڤ دووپـاتی کـردەوە: «فەرمانـدەر هەر فەرمانێـک بـدا هەر ئەوەیە. خـۆ ئەوە جـاری یەکەم نیـیە. پێشـتریش هەڵیگرتبـوو، دوای ماوەیەک داینایەوە.»

لەو سەردەمەدا لە قەفقاز بـاو بـوو کە یەکەی یەکەی سـەربازی خۆی بەر پرسـی کـڕین و ئەمبـاری پێداویسـتییەکانی هەڵـدەبژارد. بەر پرسـی بەشـی مـاڵی مـانگی شـەش ڕۆبـڵ و پەنجـا کـۆپکی بە هەر کـام لە سـەربازەکان دەدا بۆ ئەوەی خەرجی یەکە سـەربازییەکەی پیٚ دابین بکەن. کەلەرمیان دادەچاند. ئالیکیان کۆ دەکردەوە و لە گیشـەیان دەدا. عارەبانەی خۆیـان هەبوو. یەکە سـەربازییەکە بە شـانازیی دەزانـی کە ئەسپەکانیان ئالف و ئالیکی باش دەخۆن. پارەی یەکە سـەربازەییەکە لە سندووقێکدا بـوو کە کلیلەکەی بە دەسـت فەرمانـدەرەوە بـوو. زۆر جـاریش فەرمانـدەر لەو سـندووقە قەرزی بـۆ خـۆی وەردەگـرت. فەرماندەر دیسـان پارەی بە قەرز لە سندووقەکە هەڵگرتبوو و ئێستا سـەربازەکان باسـی ئەوەیـان دەکـرد. ئەو سـەربازەی کە نیگەرانـی حیسابەکە بوو دەیویست لێپرسینەوە هەبیٚ. بەڵام پانۆڤ و ئاڤدیێڤ بە پێویستیان نەدەزانی.

دوای پـانۆڤ نـۆرەی نیکیتـین[١٤] بـوو لە سـەر زگ ڕاکشـی و قەننەبکێشـیٚ. پـاڵتوکەی ڕاخسـت. خـۆی لە سـەر ڕاکێشـا و شـانی بە دارچنارەکەوە نا. سەربازەکان بێدەنگ بووبوون. لە ژوور سـەریانەوە

14- Nikitin

چڵەپۆپەی دارەکان بە دەم باوە دەشەکانەوە و خشەیان دەهات. لە ناکاو لوورە و زیقەی چەقەڵ و گورگ تێکەڵ خشە و هاژەی دارەکان بوو.

«ئەو ئاژەڵە دوابڕاوانە،چ دەنگێکی ترسناکیان هەیە!»

سەربازی سێهەمی وەدەنگ هات و گوتی: «چەقەڵەکان بە تۆ پێدەکەنن کە دەمت داچەقاوە.»

دیسان بێدەنگ بوون. تەنیا خشپەی ئەو لک و پەلی دارانە دەهات کە بەدەم باوە لێک دەخشان. بە جووڵانەوەی لقەکان ئەستێرەکان بزر دەبوون و وەدیار دەکەوتنەوە.

ئاڤدێڤ کە هەمیشە شاد بوو گوتی: «پانۆڤ، بۆ پیاو جاری وایە لە خۆڕا دڵتەنگ و خەمۆک دەبێ؟»

پانۆڤ بە بێ تاقەتییەوە گوتی: «دڵتەنگ؟ خەمۆک؟ بۆچی؟»

«هێندێ جار وام لێدێ. جاری وایە هێندە دڵتەنگ دەبم دەترسم بەڵایەک بە سەر خۆم بێنم.»

«بۆ چی بووە؟»

«ئەو جارەی هەر چی پارەم پێبوو دام بە مەشرووب و خواردمەوە. خەمۆکی هاتە جەستەم و وام لێهات بە خۆمم گوت وا باشە بە تەواوی خۆم مەست و بێ خەبەر بکەم.»

«بەڵام هێندێ جار مەستی کارەکەت لێ ئاڵۆزتر دەکات.»

«بەڵێ دەزانم. هەروایە. بەڵام جاری وایە پیاو نازانێ چیبکات و چۆن خۆی لەو تەنگژەیە دەرباز بکات.»

«بۆ دڵتەنگ دەبێ؟»

«لە من دەپرسی؟ جا دیارە، پیاو هەست بە غەریبی و بێکەسی دەکات.»

«بارودۆخی ماڵ و ژیانت چۆنە، ڕازیی؟»

«نا، دەوڵەمەند نیم، بەڵام چاومان لە دەستی خەڵکیش نییە.»

بۆ چەندەمین جار دەستی کرد بە باس کردنی حاڵ و ژیانی خۆی بۆ پانۆڤ:

«من خۆم و بە داخوازیی خۆم هاتم بۆ سەربازی. بە جێی براکەم هاتم. ئەو ژن و منداڵی هەبوو. چوار منداڵی هەیە. من تازە زاوا بووم. دایکم پێداگریی دەکرد کە من بە جێی براگەورەکەم بێم بۆ سەربازی. گوتم قەیناکا ڕەنگە دواتر پێ بزانن و بۆم قەرە بوو بکەنەوە. چووم بۆ لای ئاغای گوندەکەمان، ئاغا زۆر پیاوی چاک بوو، گوتی تۆ کوڕێکی باش و ڕۆحسووکی. کارێکی باش دەکەی بە جێی براکەت دەچی بۆ سەربازی. منیش بە قسەی ئەوم کرد و بە جێی براکەم هاتم بۆ سەربازی.»

پانۆڤ گوتی: «کارێکی باشت کرد.»

«بڕوام پێدەکەی بیکە و نایکەی مەیکە. هێندێ جار بەو هۆیە خەم دامدەگرێ، لە خۆم دەپرسم بۆ چی بە جێی براکەت هاتی بۆ سەربازی؟ ئێستا ئەو لەوێ وەک شا دەیگوزەرێنێ و تۆش لێرە دەبێ ڕەنج بکێشی. هەر چی بیری لێدەکەمەوە خەمێک دڵم ڕێک دەگوشێ و بە دەست خۆم نییە. دڵتەنگ دەبم. خۆم بە دەستی خۆم ئەو قوڕەم بۆ خۆم گرتەوە و بەدبەخت بووم.

ئاڤدێڤ بێدەنگ بوو. دوای تاوێک گوتی: «چۆنە دیسان قەننەکە ساز کەینەوە و مژێکی لێدەین.»

«خراپ نییە. سازی کەوە.»

بەڵام ئەوەیان لە بیر نەبوو کە سەرباز لە کاتی بۆسەداناندا نابێ قەننە و جگەرە بکێشێ. هێشتا ئاڤدێڤ هەڵنەستابوو بۆ ساز کردنی

قەننەکە، جگە لە خشەی لکی داران لە لای ڕێگاکەوە ترپەی پێ هاتە گوێ. پانۆڤ تفەنگەکەی هەڵگرت و بە نووکی قاچی لە نیکیتینی کوتا، نیکیتینیش هەستا. پاڵتۆکەی کۆکردەوە و سەربازەکەی دیکەش کە ناوی بۆندرانکۆ[15] بوو لە جێی خۆی هەستا و گوتی: «چ خەونێکی سەیرم دەدی.»

ئاڤدێڤ گوتی: «وسسست!»

سەربازەکان جووڵەیان لە خۆیان بڕی و گوییان شل کرد. دەنگی ترپەی پێی مرۆڤ دەهات کە تەختی کەوشەکانیان نەرم بوو. خشپەی پێیان لە سەر گەڵاوەریوەکان سات بە سات لەو تاریکییەدا نزیکتر دەبۆوە. گوێیان لە دەنگیان بوو بە زمانی چێچێنی قسەیان دەکرد. ئێستا ئیتر سەربازەکان تەنیا خشپەی پێیان نەدەبیست. تاپۆی دوو کەسیشیان دەدی. نزیک بوونەوە. پانۆڤ دەست بە تفەنگ هەڵات بۆ سەر جادەکە و سێ سەربازەکەش بە دوایدا:

«ئێوە کێن؟»

«منم. چێچێنییەکی خۆمانە.»

باتا بوو.

«تفەنگم پێ نییە. شمشێرم پێ نییە. ئاماژەی بە خۆی کرد و گوتی: «کارم بە شازادە ڤۆرۆنستۆڤە.»

ئەوەی کەڵەگەتتر بوو بێدەنگ لە پەنا هاوڕێکەی ڕاوەستا بوو. ئەویش چەکی پێنەبوو. پانۆڤ بە سەربازەکانی گوت: «دەڵێ ڕاسپاردەیە و کاری بە جەنابی عەمیدە.»

باتا گوتی: «کارم بە شازادە ڤۆرۆنستۆڤە. کارێکی زۆر گرنیگ.»

---

15- Bondarenko

پانۆڤ گوتی: «زۆر باشە، زۆر باشە. دەتبەم بۆ لای.» بە ئاڤدێڤی گوت: «تۆ و بۆندرانکۆ بیانبەن بۆ لای عەمید. ئەوان ڕادەستی ئەفسەری کێشک بکەن و خێرا بگەڕێنەوە. ئاگاداربن لە پێشتانەوە بن.»

ئاڤدێڤ تفەنگ و سەر نێزەکەی ڕاست کردەوە و گوتی: «ئەوە لە مۆغەرەی پشتیان هەڵچەقێنم، چۆنە؟»

بۆندرانکۆڤ گوتی: «چیت وەگیر دەکەوێ.»

«باشە پێشم کەون.»

کاتێک خشپەی پێی ئاڤدێڤ و بۆندرانکۆ و دوو پیاوە چێچێنییەکە نەماو دوور کەوتنەوە، پانۆڤ و نیکیتین گەڕانەوە شوێنی کەمینەکەیان.

نیکیتین گوتی: «بەم شەوە ئەوانە چ کارێکیان هەیە؟»

«ڕەنگە کارێکی گرنگیان هەبێ.»

هەواکەی ساردتر بوو. پانۆڤ پاڵتۆکەی لە بەر کرد و لە سەر کۆلکەدارەکە دانیشت. دوو سەعات دواتر ئاڤدێڤ و بۆندرانکۆ گەڕانەوە.»

«ڕادەستتان کردن؟»

«بەڵێ، عەمید هێشتا نەخەوتبوو. ئەوانمان ڕاست برد بۆ لای خۆی. ئەو سەر تاشراوانە کەسانێکی خراپ نین. قسەم لەگەڵ یەکیان کرد، زۆر لە کەسێکی باش دەچوو.»

«کەسانێکی خراپ نین. لەگەڵ ڕووسەکان هیچ جیاوازییەکیان نییە. من شتێکم دەگوت خێرا وەڵامی دەدامەوە. لە کەسانێکی خراپ نەدەچوون.»

«بەڵـــێ وایە، ئەگەر بە تەنیـــا وەگیریـــان دەکەوتـــی، ورگ و ڕیخۆڵەتیان بە گۆڕێ وەردەکرد.

پانۆڤ گوتی: «هەواکەی خەریکە ڕوون دەبێتەوە.»

ئاڤـــدیێڤ گـــوتی: «بەڵـــێ، ئەســـتێرەکان خەریکـــن وردە وردە دەکوژێنەوە.»

هەر لەوێ دانیشتن و دیسان بێدەنگ بوون.

## سێ

پەنجەرەی خەوگەکان و ماڵەکانی قەڵا، ماوەیەک بوو تاریک داگەڕا بوون. بەڵام پەنجەرەی بەشکۆترین ماڵ هێشتا ڕووناک بوو.

شازادە سیمۆن میخاییلۆڤیچ[16] لەو ماڵەدا دەژیا. فەرماندەری یەکە سەربازییەکەی ئەوێ بوو. یاوەری تێزار و کوڕی فەرماندەری گشتیی هێزە چەکدارەکان بوو. ژنەکەی ماریا ڤاسیلییۆڤنا[17] یەکێک لە ژنە شۆخوشەنگەکانی سەنپترزبۆرگ بوو. ئەوان لەوێ پێکەوە دەژیان. تا ئێستا هیچ کام لە دانیشتووانی ئەو قەڵایە بە ڕادەی ئەوان گرنیگی بە ڕازاندنەوەی ماڵ و بریقوبریق نەدا بوو. بە لای ڤۆرۆنتسۆڤ و ژنەکەیەوە وای دەنواند کە نەک ژیانێکی ئاساییان هەیە بەڵکو لە زۆربەی پێداویستییەکانی ژیانیش بێبەشن. بەڵام بە لای دانیشتووانی قەڵاکەوە ڕازاوەیی و زەرقوبەرقی ماڵەکەیان نەک سەرسووڕهێنەر بەڵکوو بێ وێنەشی دەنواند.

ئەو شەوە خانم و ئاغای خانەخوێ لەگەڵ دۆست و هاوڕێکانیان خەریکی پاپەزێن بوون: لە سەر مێزێک کە بە چوار شەمدان ڕووناک بووبۆوە، لە ژوورێکی میوانداریی پڕ لە فەرش و پەردەی گرانبایی و پەیکەرە و کەلوپەلی ئەنتیکەدا، شازادە ڤۆرۆنتسۆڤ، بە دەموچاوێکی درێژۆکە و باریکەوە، ڤاکسیلی یاوەریی بە سەر شانییەوە بریقەی

---

16- Simon Mikhailovich Vorontsov

17- Marya Vasilievna

دەهــات. شــەریکی یارییەکەشــی لاوێــک بــوو بە ڕووخســارێکی خەمبارەوە. ئەو لاوە خوێندنی لە زانکۆی پترزبۆرگ تەواو کردبوو و لە لایەن خێزانـی ڤۆرۆنتسـۆڤەوە وەک مامۆسـتای سـەر مـاڵێی کـوڕە چکۆڵەکەی خـانم، کە بەرهەمـی ژیـانە هاوبەشـییەکەی پێشـووی بـوو، دامەزرابـــوو. حەریفەکـــانی ئەوان دوو کەس لە ئەفســـەرانی یەکە سەربازییەکە بوون. یەکیان دەموچاوێکی سوور و پانی هەبوو، نـاوی پۆلتۆراتســکی[18] بــوو و فەرمانــدەری ئەو لیــوایە بــوو کە لە یەکەی گاردی سەڵتەنەتییەوە ناردبوویان بۆ ئەوێ. ئەوی دیکەشیان یاوەری لیواکە بوو و ڕاست و ڕەپ لە سەر کورسییەکە دانیشتبوو. بەژن و باڵایەکی جوانی هەبوو بەڵام نێو چاوانی گرژ بوو و دەتگوت لەشـی داگیــراوە. شــازادە خــانم ماریــا ڤاســیلیۆڤنا ژنێکــی بــاڵابەرزی شۆخوشـــەنگ و چـــاو و بـــرۆ ڕەش بـــوو. لە پـــاڵ پۆلتۆراتســـکیدا دانیشتبوو. داوێنی کراسەکەی لە قاچی ئەو دەدرا. چاوی لە پەڕەکانی دەکـرد. قسـە و زەردەخەنە و ڕوانـین و بـۆنی خۆشـی شـازادە خـانم بووبووە هۆی ئەوەی پۆلتۆراتسکی هۆش و ئیختیاری لە لا نەمێنـێ و ئاگای لە یارییەکە ببڕێ. گوێ پێنەدان و ڕەفتاری ناسروشـتیی ئەو لە یارییەکەدا سات لە دوای سات شەریکەکەی تووڕەتر دەکرد.

یاوەری لیوا ڕقـی هەسـتا و گـوتی: «کوا ئەوە یارییە تۆ دەیکەی؟ بۆ چـی "ئـاس"ەکەت فڕێدا؟» دەموچـاوی سـوور هەڵگەڕابـوو. چەقۆت لێدایە خوێنی نەدەهات

پۆلتۆراتسکی وەک کەسێک کە تـازە لە خەو هەسـتابێ چـاوێکی لە شەریکە یارییەکەی کرد کە تێنەگەیشتوویی لێ دەباری.

---

18- Poltoratsky

ماریـا ڤاسـیلیۆڤنا بە پێکەنیـنەوە ڕووی لە پۆلتۆراتسـکی کـرد و گـوتی: «نەمگـوت؟» پۆلتۆراتسـکی نـاڕەزایەتیی خـۆی دەبـڕی کە ئەو شتێکی تری گوتووە.

ژنە لیـی پرسـی: «کەوایە چـیم گـوت؟» بزەیەکـی هێنـدە شـیرین لە سـەر لێوی بـوو کە پۆلتۆراتسـکی لە خۆشـیانا خەریـک بـوو بفـڕێ و دەستی دا پەڕەکان کە بڕیان لێدا.

ئاجودان بە ویقارەوە گوتی: «نۆرەی تۆ نییە پەڕ دانێی.» خۆشـی زۆر بە پەلە هات پەڕ دانێ.

لەو کاتەدا پێشخزمەتی شازادە ڤۆرنتسـۆڤ هـاتە ژووریٚ و گـوتی: «ئەفسـەری کێشـک دەیـهەوێ شـتێکتان عەرز بکـات.» شـازادەکە ڕووسـیی بە زاراوەی ئینگلیـزی بێـژ دەکـرد، گـوتی: «هاوڕێیـان بمبوورن. ماریا، بە جێی من تۆ یاری بکە.»

شـازادە خـانم پرسـیی: «ئێـوە ڕازیـن؟» بەپەلە هەسـتا و بە شیلەبزەیەکەوە کە ڕەزایەتی لێ دەباری لە سـەر جێگای مێردەکەی دانیشت.

ئـاجودان گـوتی: «مـن هەمیشـە ڕەزایەتـم لە سـەر هەمـوو شـتێک هەیە.»

دڵخۆش بوو کە شازادە خانم کە شارەزای یاری نییە بۆتە ڕەقیبی و بەرەوڕووی دانیشـتووە. پۆلتۆراتسـکی هەر دوو دەسـتی کـردەوە و پێکەنی.

شـازادە ڤۆرۆنتسـۆڤ بە پێکەنیـنەوە گەڕایەوە و گـوتی: «کـاتی ئەوەیە شامپانی بخۆینەوە!»

پۆلتۆراتسـکی گـوتی: «مـن هەمیشـە حەزم لە خـواردنەوەی شامپانییە.»

یاوەر گوتی: زۆریش حەز دەکەین بخۆینەوە.»
«ڤاسیلی، شامپانی بێنە.»
ماریا ڤاسیلیۆڤنا پرسی: «کێ بوو؟ چ کارێکیان هەبوو؟»
شازادە ڤۆرۆنتسۆڤ شانی هەڵتەکاند و گوتی: «هەموو شتێک بۆ گوتن نابێ.»
شازادە خانم وەڵامی دایەوە: «هەموو شتێک بۆ گوتن نابێ؟ دوایی پیشانت دەدەم دەبێ یان نابێ!»
شامپانییان هێنا. هەمووان خواردیانەوە. حیسابی بردنەوە و دۆڕاندنیان ڕوون کردەوە. کاتی خوداحافیزی شازادە لە پۆلتۆراتسکیی پرسی: «یەکە سەربازییەکەی ئێوە سبەینێ دەبێ بچێ بۆ لێڕەوارەکە.»
«بۆ، چی بووە؟»
شازادە بە بزەیەکەوە گوتی: «سبەینێ دەیبینین.»
پۆلتۆراتسکی گوتی: «زۆریش خۆشحاڵ دەبم.» لە خۆشیی ئەوەی تا چەند ساتێکی تر دەستی ماریا ڤاسیلیۆڤنا دەگوشێ، پێی وەعەرزی نەدەکەوت.
ماریا ڤاسیلیۆڤنا، هەروا کە عادەتی خۆی بوو، دەستی بەرانبەرەکەی نەک هێندێک بەڵکوو زۆر بە توندی دەگوشی. دیسان وەبیری هاتەوە لە کاتی یارییەکەدا پەڕی خشتی بە هەڵە داناوە و دڵی ئەوی بە بزەیەکی شیرین و دۆستانە و پڕ مانا خۆش کردووە.
حاڵی پۆلتۆراتسکی تەنیا ئەو کەسانە تێی دەگەن کە دایمە خەریکی هاتووچۆ کردنی کۆڕ و دانیشتنی گەورەکان بن و ماوەیەکی زۆر لە سەربازخانەیەکی دوورە دەست و لە تاراوگە بژین و لە ناکاو دوای

ماوەیەکی زۆر تەنیایی، ببێتە هاونشینی ژنێک لە چینی هاوشانی خۆی، ئەویش ژنێکی وەک ماریا ڤاسیلیۆڤنا.

گەیشتەوە ئەو ماڵەی کە لەگەڵ هاوڕییەکی لەویدا دەژیان. دیتی دەرگاکە گاڵەدراوە. لە دەرگای دا هیچ کەس نەیکردەوە. تووڕە بوو، شەقی لە دەرگاکە هەڵدا و بە مشتووی شمشیرەکەی لە دەرگای دا. ئاخری ترپەی پێیەک هات. ڤۆڤیلۆی[19] نۆکەری دەرگاکەی لە پشتەوە گاڵە دابوو. هات کردییەوە.

«هەتیوە گەلحۆیە بۆ پشتی دەرگاکەت خستووە؟»

«گەورەم مەگین شتی وا دەبێ؟»

«دیسان سەرخۆشی؟ ئێستا پیشانت دەدەم کە شتی وا دەبێ یان نا.»

ویستی لێیدا، بەڵام پەژیوان بۆوە و گوتی: «لاچۆ لە بەر چاوم. بڕۆ مۆمێک هەڵکە بیهێنە.»

ڤۆڤیلۆ زۆر سەر خۆش بوو. لە ڕیورەسمی ناودێر کردنی کوڕی وەکیل باشی ئیڤان پترۆڤیچدا هەتا بینەقاقا ئارەقی خوارد بۆوە. کە گەڕابۆوە بۆ ماڵێ ژیانی خۆی لەگەڵ ژیانی وەکیل باشی کە ماڵ و مووچە و ژن و منداڵی هەبوو و هیوادار بوو ساڵێکی تر خزمەتەکەی تەواو بێ، هەڵدەسەنگێنێ. بۆیە خەم دایدەگرێ و هۆش و ئیختیاری لێدەبڕێ. لەشی دادەگیرێ و لە ترسی ئەوەی خەوێکی قورس دایگرێ یان بێهۆش بکەوێ و دز بێت هەموو ماڵە بپێچێتەوە، هەڵدەستێ دەرگاکە گاڵە دەدا و ڕادەکشێ. سەر خۆشی و خەو چۆک دادەدەنە سەر سنیگی و خەوێکی قورس دایدەگرێ.

---

19 Vovilo

پۆلتۆراتسکی هێشتا منداڵ بوو کە ڤۆڤیلۆی کردە خزمەتکاری خۆی. ئەو ڤۆڤیلۆی وەک خزمەتکاری خۆی ڕاگرتبوو و هەموو کارەکانی پێ ئەنجام دەدا. ڤۆڤیلۆ چل ساڵی تەمەن بوو، بەڵام هێشتا ژنی نەهێنا بوو. دەبوو لەگەڵ ئاغا لاوەکەی واتە پۆلتۆراتسکی لەم سەربازخانەوە بۆ ئەو سەربازخانە بڕوا و خزمەتی بکات. ئاغاکەی پیاوێکی خراپ نەبوو، ئازاری نەدەدا، بەڵام ئەو ژیانە چ کەڵکێکی هەبوو؟ پۆلتۆراتسکی بەڵێنی پێدا بوو لە قەفقاز بگەڕێنەوە ئازادی دەکات. بەڵام تازە ئازاد بوونی هیچ کەڵکێکی نەبوو، چ کارێکی لە دەست دەهات و چیی پێدەکرا. سەگ ژیانێکی لەو باشتری هەبوو.

پۆلتۆراتسکی چووە ژوورە هابەشەکەی خۆی و تیخۆنۆڤی[20] هاوڕێی.

تیخۆنۆڤ کە نەخۆش بوو و لە جێدا کەوتبوو لێی پرسی: «دیسان دۆڕاندت؟»

«نا، حەڤدە ڕۆبڵم بردەوە!»

«تێریشت چاو لە ماریا ڤاسیلیۆڤنا کرد؟»

«بەڵێ، پڕ بە دڵ چاوم لێکرد.»

«یەک دوو سەعاتی تر دەبێ هەستین. بڕیار وایە سەعات شەش دەست پێبکەین.»

پۆلتۆراتسکی هەرای کرد: «ڤۆڤیلۆ لە بیرت نەچێ سەعات پێنج خەبەرم کەوە!»

«جا ئەگەر شەڕم لەگەڵ بکەی بۆ خەبەرت بکەمەوە؟»

«ئەوە پێم گوتی! سەعات پێنج خەبەرم کەوە.»

---

20- Tikhonov

ڤۆڤیلۆ چەکمە و جلەکانی پۆلتۆراتسکی هەڵگرت و گوتی: «بە چاوان.»

پۆلتۆراتسکی چووە نێو پێخەفەکەیەوە. جگەرەیەکی داگیرساند. مۆمەکەی کوژاندەوە و لەو تاریکییەدا بە ژن و باڵا و ڕوخساری جوان و بزەتێزاوی ماریا ڤاسیلیۆڤنای هێنایە بەر چاوی خۆی.

***

شازادە و شازادەخانم لە ڕێوە نەخەوتن. دوای ڕۆیشتنی میوانەکان، شازادە خانم چوو لە بەر دەمی مێردەکەی ڕاوەستا و بە شێوەیەکی دڵمەندانە گوتی: «دەی ئێستا پێم بڵێ چ خەبەر بوو؟»

«بەڵام، خۆشەویستەکەم...»

«من خۆشەویست و ئەو شتانە نازانم، چ هەواڵێکیان هێنا بوو، پێم بڵێ.»

«وای دانانیین هێناویانە. خۆ نابێ من هەموو شتێک بە تۆ بڵێم.»

«پێم ناڵێی؟ زۆر باشە! حەز دەکەی من پێت بڵێم؟»

«تۆ؟»

«لەلایەن حاجی مرادەوە بوو، نا؟»

ماوەیەک بوو ماریا ڤاسیلیۆڤنا بیستبووی دەیانهەوێ لەگەڵ حاجی مراد دانووستان بکەن. ئێستا پێی وابوو حاجی مراد خۆی هاتووە چاوی بە مێردەکەی بکەوێ. ڤۆرۆنتسۆڤ حاشای لێ نەکرد بەڵام گوتی تەنیا پەیامێک لە لایەن حاجی مرادەوە هاتبوو. حاجی مراد هەواڵی نارد بوو کە سبەینێ دێت و چاوی بە شازادە دەکەوێ: هەر لەو شوێنەی لێرەوارەکەش دەبوو چاویان بەیەک بکەوێ کە بڕیار بوو سبەینێ سەربازەکان بچن بۆ داربڕین.

لەو ژیانە یەک ڕەواڵەی قەلادا ئەو ژن و مێردە بەو ڕووداوە زۆر خۆشحاڵ بوون. هەتا سەعات دووی نیوەشەو پێکەوە قسەیان کرد کە باوکی شازادە بە بیستنی ئەو هەواڵە چەندە دڵخۆش دەبێ. پاشان چوونە سەر پێخەفەکەیان و خەوتن.

## چوار

حاجی مراد ڕایکردبوو بۆ ئەوەی نەکەوێتە داوی ئەو چەکدارانەوە وا شامیل بۆ دەستگیرگرتنی ئەو ناردبوونی. دوای سێ شەو بێ خەوی، هەر کە سادۆ پێی گوتبوو شەوخۆش خەوی لێکەوتبوو. هەموو جلەکانی هەروا لە بەریدا بوو. سەری کرد بووە سەر دەستی. هەر دوو هەنیشکی بەو بالیفانەوە نابوو کە خاوەنماڵ بۆی دانابوو.

ئیلدار هێندێک لەو لاترەوە، لە پاڵ دیوارەکەدا لە سەر گازەرای پشت خەوتبوو. لاقە بەهێزەکانی ڕاکێشا بوو. کراسێکی سپی سینگی داپۆشیبوو کە فیشەکدانی لە سەر قایم کرد بوو. سەرە تازە تاشراوەکەی لە سەر بالیفەکە خزیبووە خوارێ. لێوی سەرەوەی کە تازە خەتی دابوو، وەک لێوی منداڵ دەجوولایەوە، وەک ئەوەی شتێک بمژێ. ئەویش وەک حاجی مراد شەشلوول و خەنجەرەکەی لە نێوقەدی نەکرد بۆوە. سۆباکە بە ئارامی دەگڕا. چرای سەر تاقەکە گڕەکەی داکێشرا بوو و شۆقێکی کزی بە بنمیچەکدا بڵاو کردبۆوە.

نیوەشەو تەرکی ژوورەکە ترپەی هات. سادۆ هاتە ژوورێ، زۆر بە هێواشی دەجوولایەوە.

حاجی مراد کە دەتگوت خەو نەچۆتە چاوی، لێی پرسی: «ها! خەبەر چییە؟»

سادۆ لە بەر قاچیدا دانیشت و گوتی: «دەبێ چارەیەک بدۆزینەوە. ژنێک ئێوارە لە سەربان بووە، چاوی بە تۆ کەوتووە و بە مێردەکەی گوتووە تۆ لە ماڵی ئێمەی. یەکێک لە جیرانەکان هەر ئێستا هەواڵی هێنا کە ڕیش سپییەکانی گوند لە مزگەوت کۆ بوونەوە بۆ ئەوەی تەگبیر و ڕاوێژ بکەن بۆ دەستگیرکردنی تۆ.»

حاجی مراد گوتی: «دەبێ بڕۆم.»

سادۆ گوتی: «ئەسپەکان ئامادەن.» بە پەلەش لە ژوورەکە چووە دەرێ.

حاجی مراد بە سرتە گوتی: «ئیلدار!»

ئیلدار بە بیستنی ناوی خۆی لە ڕێوە هەستا کڵاوکەی ڕاستەوپاستە کرد.

حاجی مراد پاڵتۆکەی لە بەر کرد، تفەنگەکەی کردە شانی و بە لۆی مێزەرەکەی دەموچاوی داپۆشی. ئیلداریش بە گورجی ئەوەی کرد و هەر دووکیان بێ چرپە لە ماڵەکە هاتنە دەرێ. کوڕە چاو ڕەشەکە ئەسپەکانی هێنا.

جیرانێکیان خرمەی پێی ئەسپەکانی بیست. لە ماڵێ هاتە دەرێ و بە هەڵەداون ڕۆیشت بۆ لای مزگەوت. مانگ بەدەرەوە نەبوو، بەڵام ئەستێرە بە سینگی ڕەشی ئاسمانەوە دەدرەوشانەوە. بینای مزگەوتەکە لە هەموو ماڵەکان بەرزتر بوو. لەوێوە هەروا و هۆریا و زەنازەنا دەهاتە گوێ.

حاجی مراد بە خێرایی تفەنگەی بە دەستەوە گرت و کۆلاسی کێشا. پێیەکی نایە سەر ڕکێفی ئەسپەکە و گورج و نەرم خۆی خستە سەر ماڵی زین.

به خانەخۆیکەی گوت: «خودا خێرت وەرێ بێنێ.» قاچەکەی دیکەی لەو تاریکییەدا خۆی چووە سەر ڕکێفەی دیکە. بە دەسکی خەرەزەنەکەی ئاماژەی بە کوڕە چاو ڕەشەکە کرد وا ئەسپەکانی هێنا بوو، تێیگەیاند هەوساری ئەسپەکان بەردا. کوڕە هەو سارەکانی بەردا و چووە دواوە. ئەسپەکەی حاجی مراد بە نەرمەغار بەرە و کۆڵانی سەرەکیی گوند سەری پێوەنا، ئیلداریش بە دوایدا. سادۆش بە کەڵپۆسەوە چەند هەنگاو بە دوایاندا هەڵات. لە سەر دووڕێیانی کۆڵانەکە چەند تارمایی وەدیار کەوتن. سەر ڕێگاکەیان گرتبوو.

کەسێک دەنگی هەڵبڕی: «ڕاوەستە، کێی؟»

چەند کەس هاتن سەر ڕێگاکەیان گرت. حاجی مراد بە جێی ئەوەی ڕاوەستێ، خەرەزەنی هەڵسووڕاند و ڕاست ڕووی کردە ئەو کەسانەی سەر ڕێگاکەیان گرتبوو. کشانە دواوە. ئێستا ئەسپەکەی حاجی مراد بە چوار ناڵ دەڕیشت. ئیلداریش بە دوایدا دەهات. بە پەنای خەڵکەکەدا تێپەڕین و دوور کەوتنەوە. تەقەیان لێکردن. ویزەی دوو گوللە بەبن گوێی حاجی مراد و ئیلداردا تێپەڕی. نەپێکران. لە خێراییەکەیان کەم نەکردەوە. دوای بڕینی مەودایەکی کورت ئەسپەکان کەوتبوونە هاسکە هاسکە. ڕاوەستان و گوێیان شل کرد.

لە دوورە هاژەی چۆمێکی خوڕێن دەهات. لە دوایانەوە قووقەی کەڵەشیری گوندەکە دەهات کە ئەمپەڕاوپەڕی گوند وەڵامی یەکتریان دەدایەوە. جگە لەوە هەروا و گاڵەی چەند ئەسپ سواریش دەهات کە بە دوای ئەواندا دەهاتن. حاجی مراد ئەسپەکەی بە نەرمەغار لێخوڕی و ئاوڕی دایەوە. نزیکەی بیست ئەسپ سوار بوون، خەڵکی گوندەکە بوون و دەیانویست دەستگیری بکەن؛ یان وایان دەنواند کە دەیانهەوێ دەستیری بکەن بۆ ئەوەی شامیل تۆمەتی کەمتەرخەمییان

لـێ نەدا. کاتێـک بە تەواوی نزیـک بـوونەوە حـاجی مـراد هەوسـاری ئەسـپەکەی شـل کـرد و تفەنـگەکەی بە دەسـتەوە گـرت. ئیلـداریش هەر وای کرد.

حـاجی مـراد دەنگـی هەڵێنـا: «چیتـان دەوێ؟ دەتـانەوێ دەسـتگیرم کەن. دەی باشـە، وەرن بمگـرن، چاوەڕوانی چین؟» تفەنگەکەی توند لە دەستی گرت و بەرەو دۆڵەکە داگەڕا.

سـوارەکان وەدووی کەوتـن. بەڵام نەیانـدەوێرا لێـی نزیـک ببـنەوە. حـاجی مـراد و ئیلـدار گەیشـتنە ئەو بەری دۆڵەکە. ئەو کەسـانەی بە دوایـانەوە بـوون هەرایـان کـرد؛ ڕاوەسـتە، گـوێ لە قسـەکانمان بگـرە. حاجی مراد لە وەڵامدا تەقەیەکی لێکردن و گوللەکە بە سـەر سـەریاندا ویـزەی هـات. ترسـی شـکاندە گیـانی گوندنشـینەکان و بە چـوار نـاڵ دوور کەوتنەوە.

دوای ماوەیەک ڕاوەستان. نە دەنگی سوارەکان دەهـات و نەدەنگی کەڵەشــێری دەمەوبەیــانی. خـــوڕەی چـــۆمەڵی نێـــو دارســـتان کە مۆسـیقایەکی بلاوێـن بـوو، دڵـی شـەو و دارسـتانەکەی دەلاوانـدەوە. جاروبـاریش دەنگـی تـووتەک و کونـد دەهـات. ڕەشـایی دیوارئاسـای دارستانەکە زۆر نزیکی دەنواند. هاوڕێکانی لەو دارستانە چاوەڕوانی بوون.

کە گەیشتنە دارستانەکە، حاجی مراد ڕاوەستا. هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشـا. فیتـوویەکی لێـدا و گـوێی شـل کـرد. دوای تاوێـک لە لای دارستانەکەوە دەنگی فیتوویەکی هاوشێوە وەڵامی دایەوە. حاجی مراد لە ڕێگاکە لایـدا و ڕۆیشـت بـۆ نێـو لێـڕەوارەکە. نـزیکەی سـەد مەتـر چووە پێشـێ لە نێو دارەکانـدا چـاوی بە ئاوێک کەوت. چـوار کەس لە دەوری ئاورەکە دانیشتبوون. یەکێکیـان بە گـورجی هەسـتا و هـات بـۆ

لای حاجی مراد، هەوساری ئەسپەکەی و ڕکێفەکەی گرت. خەنیفە برای شیریی حاجی مراد و ڕاوێژکاری بوو.

حاجی مراد دابەزی و گوتی: «ئاورەکە بکووژێننەوە!» ئەوانەی لە دەوری ئاورەکە بوون خێرا ئاورەکەیان پڕژوبڵاو کردەوە و بە پێلاقە کوژاندیانەوە. حاجی مراد چوو بۆ سەر ئەو عەبایەی ڕاخرا بوو و لێ پرسین: «باتا هات؟»

«بەڵێ لەگەڵ خان محەممەد ڕۆیشت.»

«لە کام لاوە ڕۆیشتن؟»

«خەنیفە وەڵامی دایەوە: «لەو لایەوە» بە دەستی ڕێگایەکی پێشان دا. حاجی مراد دڵنیا بوو. کە تووشی گوندنشینەکان نابن.

حاجی مراد گوتی: «زۆر باشە.» تفەنگەکەی لە شانی داماڵی و فیشەکی وەسەر خستەوە. ڕووی کردە ئەوانەی ئاورەکەیان دەکوژاندەوە و گوتی: «بە دوامانەوەن. وریا بن.»

یەکێک لەوان کە چێچینییەک بوو بە ناوی گەمزالۆ[٢١]؛ دەستی دا تفەنگەکەی، بەرگەکەی لێ داماڵی و بێ ئەوەی زمانی بگەڕێ ڕۆیشت بۆ ئەو لایەی دارستانەکە کە حاجی مراد پێیدا هاتبوو.

ئیلداریش دابەزی. هەوساری ئەسپەکەی حاجی مرادی گرت و لەگەڵ ئەسپەکەی خۆی بە داریکەوە هەر دووکیانی بەستەوە. ئەویش وەک گەمزالۆ دەستی دا تفەنگەکەی و ڕۆیشت بۆ لایەکی دیکەی دارستانەکە. ئاورەکە گوژابۆوە. بەرەبان بوو، ئیتر دارستانەکە زۆر تاریک نەبوو، بەڵام ئەستێرەکان هەروا بە ئاسمانەوە سریوەیان دەهات.

---

21- Gamzalo

حــاجی مــراد چــاوی لە ئاســمان کــرد. کە دیتــی کــۆتەرازوو گەیشتووتە چەقی ئاسمان، زانیی کاتی نوێژە. هەستا داوای لە خەنیفە کرد ئەو قومقومە ئاوەی بداتێ کە هەمیشە پێیان بوو. عەباکەی بە شانیدا دا و دەستنوێژی گرت، پاشان ڕوو بە قیبلە نوێژی دابەست.

کە سڵاوی نوێژەکەی دایەوە، هاتەوە شوێنەکەی خۆی دانیشت و بە گۆمی فیکر و خەیاڵدا ڕۆچوو.

حاجی مراد هەمیشە لە بەختی خۆی ڕازی بوو. چونکە کاتێک لە زەینــی خۆیــدا پلانێکــی دادەڕشــت، دڵنیــا بــوو بە شــێوەیەکی ســەر کەوتووانە ئەنجامی دەدا. لە تەواوی ماوەی ژیانی پڕ لە کەندوکۆسپی خەباتگێڕییــدا، زۆر بەدەگــمەن هەڵکەوتبــوو پلانێکــی ڤەشــەل بێنــێ. دەیهێنــایە بەر چــاوی خــۆی چــۆن لەگەڵ ئەو هێــزەی کە شــازادە ڤۆرۆنتســۆڤ دەیخــاتە ئیختیــارییەوە هەڵــدەکوتێتە ســەر شــامیل، دەستگیری دەکات و تۆڵەی خۆی لێ دەکاتەوە. پێی وابوو تێزاری ڕووس پاداشــی دەداتــێ. نەک دیســان دەبێــتەوە بە فەرمــانڕەوای ئاڤاریا[22]، بەڵکوو تەواوی چێچێنییەکانیش دەکەونە ژێر فەرمانی ئەو. بەو خەیاڵانەوە خەوی لێ کەوت.

لە خەونیدا هاوڕێ گیانلەسەردەستەکانی سروودیان دەخوێند و هاواریــان دەکــرد: «حــاجی مــراد بەڕێــوەیە! حــاجی مــراد ئەوا دێ!» ئەویــش ژن و منــداڵی شــامیلی بە دیــل گرتبــوو و ئەوان دەگریــان و شیوەنی ژن و منداڵەکانی شامیل، زووقەزووق و لوورەلووری ڕێوی و چەقەڵەکانی دارستانە. حاجی مراد لە یەکێک لە هاوڕێکانی پرسی:

---

22- Avdria

«خەبەرتـــان لە خـــان محەمـــمەد هەیە؟» کە پێیـــانگوت هێشـــتا نەگەڕاوەتەوە سەری بەلادا خست و هەمیسان خەوی لێکەوتەوە.

بە دەنگـی خـان محەمـمەد کە لەگەڵ باتـا گەڕا بـوونەوە لە خەو ڕاپەڕی. خان محەممەد خێرا لە پالیدا دانیشت و باسی چاوپێکەتنی خۆی و شـازادەی بـۆ گێـڕایەوە. شـازادە بە دیتنـی زۆر خۆشـحاڵ بووبـوو و بڕیـاری دابـوو بـۆ بەیـانی لەو شـوێنەی کە سـەربازە ڕووسییەکان داردەبڕن، ئەو لای میتچیک و قەراغ ڕێگا لێڕەوارییەکەی شالین، بێت چاوی بە حاجی مراد بکەوێ. باتاش هێندێ جار قسەکەی لە دەمـی خـان محەمـمەد دەسـاند و باسـی چـۆینەیتی دیـدار و بڕیارەکەی دەکرد.

حـاجی مـراد زیـاتر حەزی دەکـرد گـوێی لەو وتـانە بـێ کە ڤۆرۆنتسۆڤ کاتی بیستنی هاوکاریی حاجی مراد لەگەڵ ڕووسەکان دەریبڕیبـوو. خـان محەمـمەد و باتـا یەکـدەنگ گوتیـان شـازادە گوتوویەتی وەک میوانێک لەگەڵ حاجی مراد ڕەفتار دەکات و هەموو پێدا ویستییەکی ژیان و هێمنایەتیی بۆ دابین دەکات.

حاجی مراد سەبارەت بە ڕێگاکە پرسیاری کرد، خەنیفە چونکە دڵنیـا بـوو شـارەزای ڕێگـاکەیە، گـوتی ڕاسـت دەیبـا بـۆ شـوێنی چاوپێکەوتنەکە، جزدانەکەی دەرهێنـا و ئەو سـێ ڕۆبڵەی بەڵێنـی بە باتا دابوو، پێدا. پاشان داوای لە هاوڕێکانی کرد تفەنگە زێڕکفتەکەی لە خـۆرجینەکە بـۆ دەرهێنن و جلـوبەرگی جـوان و ڕێکوپێـک لە بەر بکەن، بۆ ئەوەی لە بەر چاوی ڕووسەکان جوان و ڕێکوپێک بنوێنن.

کاتێـک زیـن و بەرگ و تیسقەوفلاسـقی ئەسـپەکانیان خـاوێن دەکردەوە، ئەستێرە بە ئاسمانەوە نەما، گزنگی بەیان ئەنگووت، سپێدە وڵاتی زێوئاژن کرد و سروەی فێنکی بەیان هەڵیکرد.

## پێنج

کەڕەی بەیانی کە هێشتا هەوا تاریک بوو، دوو دەستە سەربازی تەور بە دەست، لە ژێر فەرمانی پۆلتۆراتسکی لە دەروازەی شاهگرنیسک هاتنە دەرێ و شەش مایل ڕێگایان بڕی. دوای ئەوەی چەند قەرەوڵیان لە سەر پۆستەکان دانا و هەوا ڕۆشن بۆوە، دەستیان کرد بە داربڕین. نزیک کاتژمێر هەشت، لەگەڵ دووکەڵی ئەو ئاورەی کە سەربازەکان هەڵیانکردبوو. تۆزێ تەمومژەکە ڕەوی؛ بەڵام هەواکە هەروا لێڵ بوو و سەربازە داربڕەکان پێنج هەنگاو پێش دەمی خۆیان نەدەدی، چاویان بە ئاورەکان کەوت و جادەی نێو دارستانەکە بە داری بڕدراو گیرا بوو. خۆر وەک کەشەفێکی ئاگرین لە پشت تەمتومانەوە جاروبار بە دیار دەکەوت و دیسان بزر دەبۆوە.

لە دەرووی لێڕەوارەکەدا و هێندێک دوور لە جادەکە، پۆلتۆراتسکی لەگەڵ ملازم تیخۆنۆڤ و دوو ئەفسەر لە دەستەیەکی تر و بارۆن فریز[23] «ئەفسەری پێشوو کە بە هۆی بەشداری کردن لە دوئێل نیشانەی ئەفسەرییەکەی لێ سەندرابۆوە و پلەی سەربازێکی ئاسایی هەبوو، لە سەر چەند تەنەکە دانیشتبوون. کاغەزی دڕاو کە خواردنیان تێوەپێچا بوو، لەگەڵ قوونچکە جگەرە و بتڵی بەتاڵ لە

23- Baron Freze

دەوربەریان بڵاو بووبۆوە. ئەفسەرەکان برێکیان ڤۆدکا خواردبۆوە. سەربازێک خەریک بوو سەری بتڵێکی دیکەی هەڵدەپچڕی.

پۆلتۆراتسکی هەرچەند شەوی ڕابردوو کەم خەوتبوو، بەڵام شادییەک لە دڵیدا بوو کە دەتگوت بە هۆی ئەو هاتنەی لەگەڵ هاوقەتاران و سەربازەکان، کە هێندێک هەستیان بە مەترسی دەکرد، ئەو هەستی شادییە لە ناخیدا سەری هەڵداوە.

ئەفسەرەکان، سەرقاڵی ئاخافتن و دەمەتەقێ بوون و باسی دوایین هەواڵی مەرگی ژێنڕاڵ سلێپتسۆڤ[24] یان دەکرد. هیچکامیان لە بیری ئەوەدا نەبوون کە سەبارەت بە گرنیگترین کاتی ژیان - یانی ئەو ساتەی کە ژیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەرچاوەیەی وا لێوەی هەڵقوڵیوە - بدوێن؛ تەنیا ئازایەتیی ئەفسەرێکیان لە بەر چاو بوو کە دەست بە شمشێر هەڵدەکوتێتە سەر چیانشنیان و بێ بەزەییانە هەموویان لەتلەت و قەلاچۆ دەکات.

ئەگەر چی هەموویان بە تایبەت ئەو کەسانەی کە ئەو کاتە لە شەڕی قەفقازدا بەشدارییان کردبوو، دەیانزانی و نەیاندەتوانی خۆی لێ گێل بکەن کە شەڕی دەستەویەخەو بە شمشێر پارچەپارچە کردنی مرۆڤ تەنیا دروست کراوی خەیاڵ و خەونە و هیچ کات ڕوونادا؛ بەڵام بە هێمنایەتییەکی ئاوێتەی جۆرێک شانازییەوە و بە قەڵافەتێکی ئازایانەوە لە سەر قەنەکەکان دانیشتبوون و سەبارەت بە مەرگێک دەدوان کە دوور نەبوو ساتێکی تر - هەروا کە ژێنڕاڵ سلێپتسۆڤی تێکەوە پێچابوو - بەرۆکی ئەوانیش بگرێ. لە جەنگەی ئاخافتندا، وەک ئەوەی چاوە ڕوانییەکەیان هاتبێتە دی، لە لای دەستە

24- Sleptsov

چەپی ڕێگاکەوە دەنگی دڵبزوێن و هاندەری تفەنگ هات و لە نێو دارە چپڕەکاندا دەنگی دایەوە. گوللەیەک ویزەی هات و تەمومژەکەی بڕی و لە ساقەتەی دارێک درا.

پۆلتۆراتسکی بە شادییەوە گوتی: «لە شەڕگەی ئێمەوەیە.» ڕووی لە فریێز کرد و گوتی: «ئەوەتا، نێو چاوانەکەت هێنای! بگەڕێوە بۆ لیواکەت. من هەموو سەربازەکان کۆ دەکەمەوە و دەیانبەم بۆ بەرەگەی شەڕ. جەنگێکی قارەمانانە ساز دەکەین و ڕاپۆرتێکی باش و ڕێکوپێکی بۆ دەنووسین.»

فریێز گورج لە جێی خۆی هەستا و بە هەنگاوی توند و خێرا ڕۆیشت بۆ لایەک کە سەربازەکانی لەوێ بوون. ئەسپەکەیان بۆ پۆلتۆراتسکی هێنا. سوار بوو و سەربازەکانی بەرەو ئەو لایە برد کە تەقەی تفەنگەکەی لێوە هات. بایەک لە لای دارستانەکەوە دەهات و مژەکەی ڕادەدا؛ نەک لێژایی دۆڵەکە بەڵکوو ئەو بەری دۆڵەکەش بە جوانی دیار بوو. کاتێک پۆلتۆراتسکی گەیشتە بەرەگەی شەڕ، خۆر لە پشت تەمومژ هاتبووە دەرێ و دارستانەکەی پڕشنگ باران دەکرد. لەو بەری دۆڵەکە، لە داوێنی لێڕەوارەکە، بە مەودای سێسەد مەتر، چەند سوار وەبەرچاو دەکەوتن. ئەوانە ئەو چێچێنییانە بوون کە هاتبوون بە دوای حاجی مراددا تاکوو شایەدی چاوپێکەتنی ئەو و ڕووسەکان بن. یەکێکیان تەقەیەکی کرد. چەند سەربازیش لەم بەرەوە تەقەیان کرد. چێچێنییەکان کشانەوە دواوە و تەقەکردن تەواو بوو.

بەڵام پۆلتۆراتسکی کاتێک گەیشتە بەرەگەی شەڕ فەرمانی تەقەی دا. هێشتا فەرمانەکەی تەواو نەبووبوو کە ڕووسەکان تێکرا دەستیان کرد بە تەقە و داوێنی لێڕەوارەکەیان دایە بەر دەستڕێژ. سەربازەکان کە حەزیان لە سەرگەرمی و ڕابواردن بوو، لە پەستا تقەنگەکانیان پڕ

دەکرد و تەقەیان دەکرد. چێچێنییەکانیش ڕقیان هەستا و چەند گوللەیان بە ڕووسەکانەوە نا. یەکێک لە سەربازەکان بریندار بوو «هەر ئەو ئاڤدێڤەی کە شەوی ڕابردوو چوو بوو بۆ کەمین دانان.

هاوڕێکانی چوون بۆ لای. دەمەوڕوو کەوتبوو. بە هەر دوو دەستی برینەکەی زگی گرتبوو. کەوتبووە جنیگڵ لە خۆدان و هاواری دەکرد. دەینالاند. ئەو یەکێک لە سەربازەکانی دەستەکەی پۆلتۆراتسکی بوو. پۆلتۆراتسکی کە دیتی سەربازەکان لە دەوری کۆ بوونەتەوە، بە چوار ناڵ چوو بۆ لایان و گوتی:

«چییە قارەمان! بریندار بووی؟ لە کوێ؟»

ئاڤدیڤ وەڵامی نەدایەوە. ئەو سەربازەی کە هاوڕیی بوو گوتی:

«گەورەم من خەریک بووم تفەنگەکەم پڕ دەکردەوە دیتم ڕمبەیەک هەستا، کە ڕوانیم ئاڤدیڤ تفەنگەکە لە دەستی کەوتە خواریّ و دەمەڕوو کەوت.

پۆلتۆراتسکی گوتی: «پەککوو! ئاڤدیڤ ژانت زۆرە؟»

«نا، ژانی نییە، بەڵام ناتوانم هەستم. گەورەم دەستوور بفەرموون با چۆڕێکم ڤۆدکا بدەنێ.

ڤۆدکایان هێنا و پانۆڤ پەرداخێکی ئاوخۆریی پڕ کرد و پێیدا. ئاڤدێڤ هەوڵی دا بیخواتەوە، بەڵام سەری وەرسووڕاند و گوتی:

«ناتوانم بیخۆمەوە. خۆت بیخۆوە.»

پانۆڤ نای بە سەریەوە و چۆڕەی لێ بڕی. ئاڤدێڤ هەوڵی دا هەستێتە سەر پێ. بەڵام نەیتوانی. بەتانییەکیان بۆ ڕاخست و لە سەری ڕایانکێشا. وەکیل باشی بە پۆلتۆراتسکی گوت:

«گەورەم، جەنابی عەمید تەشریفیان دێ بۆ ئێرە.»

«زۆر باشە. دەچین بەرەو پیریان.

خەرەزەنێکی لە ئەسپەکەیدا و بەچوار ناڵ ڕۆیشت بەرەو پیری فۆرۆنتسۆڤ.

فۆرۆنتسۆڤ بە سواری ئەسپکی ئینگلیزی، لەگەڵ یاوەرێک و وەرگێڕێک کە زمانی چیچینی شارەزا بوو، هات و پرسیی:

«ئەوە لێرە چی ڕووی داوە؟»

پۆلتۆراتسکی وەڵامی دایەوە:

«تاقمێک یاغی هێرشیان کردە سەرمان.»

«شتی وا نابێ. ڕەنگە خۆت کێشەکەت هەڵگیرساند بێ!»

«نا گەورەم.» بە پێکەنینشیەوە گوتی: «چۆن دەتوانم کێشەی وا هەڵگیرسێنم؟ خۆیان ویستیان نزیک ببنەوە، ئێمەش بەرگریمان لێکردن.»

«دەڵێن سەربازێک بریندار بووە، وایە؟»

«بەڵێ. بەداخەوەم، سەربازێکی باش بوو.»

«برینەکەی کارییە؟»

«بەڵێ، گوللەکە لە زگی دراوە.»

«دەزانی من دەچم بۆ کوێ؟»

«نا.»

«شکیشت بۆ هیچ نا چێ؟»

«نا.»

«حاجی مراد خۆی بە دەستەوە دەدا. دەمەوێ بچم بۆ چاوپێکەوتنی ئەو.»

«بە ڕاستیتە؟ باوەڕ ناکەم!»

ڤۆرۆنتسۆڤ لەگەڵ ئەوەی نەیدەتوانی شادی و دڵخۆشی خۆی بشارێتەوە، گوتی: «دوێنێ نوێنەرەکەی هات بۆ لام. چەند خولەکی تر

لە دەرووی شالین[25] چاوەڕوانی من دەبێ. چەند کەس لە دەوروبەری دەرووەکە بڵاو بکەوە با لە بۆسەدا بن، پاشان لەگەڵ من وەرە.»

«تێگەیشتم گەورەم.»

پۆلتۆراتسکی چەند تیرەندازی لە لای ڕاستی دەرووی دارستانەکە دامەزراند و فەرمانی بە وەکیل باشی دا چەند کەسیش لە لای دەستە چەپ جێگیر بکات.

چەند سەرباز ئاڤدێڤی بریندارییان بردەوە بۆ قەڵا.

پۆلتۆراتسکی، لە کاتی گەڕانەوەدا بۆی دەرکەوت کە چەند سوار بە دوایدا دێن. کاتێک گەیشتنە نزیکی و بە تەنیشتیدا تێپەڕین، دیتی پێشەنگی سوارەکان پیاوێکی قورساخ و ڕێکوپێکە و مێزەری بە سەرەوەیە. تفەنگەکەی زێڕکفت بوو. زۆر ئازا و بەجەرگی هاتە بەر چاو. ئەو سوارچاکە حاجی مراد بوو، بە سەر ئەو ئەسپە سپییەوە دەتگوت پەیکەرەیە قیت دانیشتووە. کاتێک گەیشتە پەنا پۆلتۆراتسکی بە زمانی تاتاری شتێکی گوت. پۆلتۆراتسکی بڕۆی هەڵتەکاند و بە دەستی ئاماژەی کرد کە لە زمانەکەی تێناگات و زەردەیەکی گرت. حاجی مراد وەڵامی زەردەخەنەکەی ئەوی بە بزەیەک دایەوە و بەو مێهرەبانییە منداڵانەیەوە پۆلتۆراتسکی تووشی سەرسووڕمان کرد. پۆلتۆراتسکی چاوەڕوانیی ئەوەی نەدەکرد ئەم فەرماندەرە ترسناکەی خەڵکانی چیانشین تا ئەو ڕادەیە پاک و سادە بنوێنێ. ئێستا لەگەڵ پیاوێکی ڕووخۆش بەرەوڕوو بووبوو کە لێوبەبزە و ڕۆحسووک و بێگەردی دەنواند و دەتگوت ساڵانێکی زۆرە هاوڕێ و ناسیاوییەتی. قەڵافەتی تایبەتمەندییەکی بەر چاوی هەبوو. چاوانی لە ژێر برۆ

---

25- Shalin

ڕەشەکەیدا وەها بە وردی و هێمنییەوە دەیڕوانی کە نیگا تیژەکەی بە ناخی ڕۆح و گیانی مرۆڤدا ڕۆدەچوو.

هاوڕێکانی حاجی مراد پێنج کەس بوون؛ یەکێک لەوان خان محەممەد بوو کە شەوی ڕابردوو چوو بوو بۆ لای شازادە ڤۆرۆنتسۆڤ. خان محەممەد پیاوێکی سوورکارە بوو. چاوە ڕەشە بێ مژۆڵەکانی پڕاوپڕ لە مانا و لێوڕێژ بوون لە حەز و هیوای ژیان. بە دوای ئەودا خەنیفە بە برۆی پەیوەست و دەموچاوی کوڵکەنەوە. ئەو بەر پرسی پێداویستی و ماڵ و سامانی حاجی مراد بوو. هەوساری ئەسپێکی بە دەستەوە بوو کە چەند تێر و خۆرجینی لێ بار کرابوو. دوو کەسەکەی دیکەش یەکیان ئیلدار، گەنجێکی لێزگی بوو بە سنیگی پان و ناوقەدی باریکەوە، دەتگوت کچی عازەبە. چاوانی زۆر جوان و تازە سمێڵی بۆر کردبوو. ئەوی دیکەشیان گەمزالۆ پیاوێکی چێچێنیی کورتە باڵا بوو نە برۆی هەبوو نە برژانگ. چاوێکی کوێر بوو. جێگای برینێک لە سەر ڕوومەت و کەپۆی دیار بوو. پۆلتۆراتسکی، شازادە پۆرۆنتسۆڤی پیشان دا کە زۆر دوور نەبوو. حاجی مراد بۆ چاوپێکەوتنی شازادە چووە پێشێ. دەستی ڕاستەی لە سەر دڵی دانا و بە زمانی تاتاری شتێکی گوت. دیلمانجی چێچێنی قسەکەی وەرگێڕایەوە.

«دەڵێ، خۆم تەسلیمی تێزاری ڕووس دەکەم و دەمهەوێ خزمەتی پێ بکەم. لە مێژ بوو دەمویست ئەو کارە بکەم بەڵام شامیل نەیدەهێشت.»

دوای بیستنی قسەکانی دیلمانج، شازادە ڤۆرۆنتسۆڤ دەستی بە دەستەوانە قایشەکەیەوە بۆ لای حاجی مراد درێژ کرد. حاجی مراد گتێکی گرت، پاشان تەوقەی لەگەڵ کرد و بە گەرمی دەستی ئەوی

گوشی. سەرەتا چاوی لە دیلمانجەکە کرد و پاشان لە ڤۆرۆنتسۆڤی ڕوانی. دیلمانجەکە گوتی:

«دەڵێ نەیدەویست خۆی تەسلیمی هیچ کەسی دیکە بکات جگە لە ئێوە. چونکە ئێوە کوڕی سەردارن و جێگای ڕێزن.»

ڤۆرۆنتسۆڤ سپاس و پێزانینی خۆی دەربڕی و حاجی مراد دیسان شتێکی گوت و ئاماژەی بە هاوڕێکانی کرد. دیلمانجەکە گوتی:

«دەڵێ ئەوانە هاوڕێ و هاوسەنگەری منن، ئەوانیش دەیانهەوێ وەک من خزمەت بە تێزار بکەن.»

ڤۆرۆنتسۆڤ چاوی لێکردن و سەری لەقاند. خان محەممەدی چاوڕەش و بێ مژۆڵ و دەم بەپێکەنین وەک ئەو سەری لەقاند. قسەیەکی کرد کە وێدەچوو پێکەنینی بێ، چونکە خەنیفەی سەر و چاو کوڵکن پێکەنی و ددانە سپییەکانی وەدیار کەوتن. بەڵام گەمزالۆی یەک چاو و قژسوور چاوی لە ڤۆرۆنتسۆڤ کرد و دیسان چاوی لە گوێچکەی قوتی ئەسپەکەی بڕی.

کاتێک ڤۆرۆنتسۆڤ و حاجی مراد و هاوڕێکانی بەرە و قەڵا وەڕێکەوتن، سەربازەکانیش دەستیان لە کار هەڵگرت و پۆل پۆل لە دەوری یەک کۆبوونەوە بۆ ئەوەی بیروڕای خۆیان دەربڕن.

«مەگین خودا بزانێ تا ئەمڕۆ چەند سەرباز بە دەستی ئەو کابرایە کوژراوە. ئێستاش دیتووتە چ پێشوازییەکی لێدەکەن و ڕێزی بۆ دادەنێن!»

«ئەوە شتێکی سروشتییە؛ ئەو پێشتر دەستە ڕاستی شامیل بوو. بەڵام ئێستا ئیتر جێگای ترس نییە.»

«سەیرە، تۆ ئەو قەڵافەتەییت دیوە!»

«چاو لەو سوورەزرتەیان کە. وەک ئاژەڵی دڕندە دەیهەوێ پیاو قووت بدا!»

«ئەو دەبێ تاژیی دڕ و گوێڕایەکی سەرۆکەکەی بێ.»

لەو شوێنەی کە سەربازەکان خەریکی داربڕین بوون، ئەوانەی نزیک ڕێگاکە کۆ بوونەوە و تێکڕا سەیریان دەکرد.

ئەفسەرەکان ویستیان بڵاوەیان پێبکەن و بیانێرنەوە سەر کارەکەیان، بەڵام ڤۆرۆنتسۆڤ نەیهێشت، زەردەیەکی گرت و گوتی:

«لێیان گەڕێن با دۆستی لە مێژینەی خۆیان ببینن.»

پاشان ڕووی لە نزیکترین سەرباز کرد و بە هیواشی و بە زمانی ئینگلیزی لێی پرسی:

«ئەو پیاوە دەناسی؟»

«نا گەورەم!»

«ئەوە حاجی مرادە، ناویت بیستووە؟»

«ئەی چۆن نەمبیستووە، خودا دەزانێ لە شەڕدا چەند جارمان شکست داوە!»

«ئەرێ، هێندێ جار سەری دەخستە سەر ئێمەش.»

سەربازەکە خۆشحاڵ بوو کە فەرماندەکەی قسەی لەگەڵ کردووە. گوتی: «بەڵێ گەورەم. ڕاست دەفەرمووی.»

حاجی مراد تێگەیشت کە باسی ئەو دەکەن. زەردەیەکی گرتت.

ڤۆرۆنتسۆڤ شادو دڵخۆش گەڕایەوە بۆ قەڵا.

## شەش

ڤۆرۆنتسۆڤی لاو، لەوەی کە حاجی مراد خۆی تەسلیمی ئەو کرد بوو، نەک کەسێکی تر، لە خۆشیانا پێی وەعەرزی نەدەکەوت. ئەو توانیبووی جەنگاوەرێکی وەک حاجی مراد کە دوای شامیل یەکێک لە چالاکترین و چاو نەترسترین دوژمنی ڕووسەکان بوو، بەرە و لای خۆی ڕاکێشێ و هانی بدات بۆ ئەوەی خۆی بە دەستەوە بدات. تەنیا شتێک دڵگرانی کردبوو، ئەویش ئەوە بوو کە ژێنراڵ میلێرزاکۆملسکی[26] فەرماندە لیوای ڕووسەکان بوو لەو ناوچەیە و دەبوو مەسەلەی خۆبە دەستەوە دانی حاجی مراد لە لایەن ئەوەوە جێبەجێ بکرێ. چونکە ڤۆرۆنتسۆڤ تەواوی کاروباری دانووستانەکەی گرتبووە ئەستۆی خۆی و هیچ کەس و لایەنێکی لەو کارە ئاگادار نەکرد بۆوە. بۆیە وێدەچوو کێشە و دڵەندی بێتە ئاراوە. ئەم فیکر و خەیاڵە ئاسمانی ساوی دڵ و ئاواتی لێ لێڵ و تەمومژاوی کردبوو. کە گەیشتنەوە قەڵا، هاوڕێکانی حاجی مرادی بە یاوەرەکەی سپارد و حاجی مرادی برد بۆ ماڵەکەی خۆی.

شازادە خانم ماریا ڤاسیلییۆڤنا بە جلوبەرگی ڕازاوە و بەژن و بالای ڕێکوپێکەوە، لە کاتێکدا کە دەستی کوڕە قژسوورە شەش ساڵانەکەی گرتبوو، لە ژووری میوانداری لەگەڵ حاجی مراد بەرەوروو

26- Meller_Zakomelsky

بـوو. حـاجی مـراد دەسـتی بە سـینگییەوە گـرت و دیلمـانجەکەش کە لەگەڵی هـاتبوو قسـەکانی ئەوی وەرگێڕایەوە. حـاجی مراد بە ویقارەوە گوتی:

«چونکە خۆی بە دۆست و هاوڕێی شازادە دەزانێ و شـازادە ئەوی هێناوە بۆ ماڵەکەی، بە پێویستی دەزانێ و بە لایەوە سروشتییە کە ڕێز بۆ بنەمـاڵەی شـازادەش دابنێ و وەک دۆسـت و کەس و کـاری نزیکی خۆی بیانهێنێتە ئەژمار.

هەڵسـوکەوت و ڕەفتـاری حـاجی مـراد کەوتە بەر دڵـی ماریـا ڤاسـلییۆڤنا و لەوەی کە بە هـۆی دەستومشـتاخ لەگەڵ ئەودا تـۆزێ سـوور هەڵگەڕا بـوو، زیـاتر کەوتە بەردڵ و سـەرنجی شـازادە خـانم. داوای لێکـرد دانیشـێ. لێـی پرسـی قـاوە مەیـل دەکـات؟ بەڵام کاتێـک هێنایـان حـاجی مـراد نەیخـواردەوە زمـانی ڕووسـیی نەدەزانـی، بەڵام تێدەگەیشـت چـی دەڵـێن. کاتێـک قسـەیەکیان دەکـرد و تێنەدەگەیشـت زەردەیەکی دەگرت. بزەکەی حاجی مراد شـادی لە دڵی شـازادە خـانم گیـرا بـوو، هەر ئەو جـۆرەی کە شـیلەبزەکەی شـازادە خـانم بـاڵی بە پۆلتۆراتسـکی دەگـرت و دەیخسـتە نەشـە. کـوڕە قـژ سـوورەکەی ڤۆرۆنتسـۆڤ لە پـاڵ دایکیـدا ڕاوەسـتا بـوو، هێنـدەی باسـی ئـازایەتی و جەنگاوەریی حاجی مراد بیستبوو نەیدەتوانی چاوی لێ بترووکێنێ.

ڤۆرۆنتسۆڤ حاجی مراد و ژنەکەی پێکەوە بەجێهێشت و چوو بۆ ژووری کارەکەی و دەستی کرد بە نووسینی ڕاپۆرتی خۆ بە دەستەوە دانـی حـاجی مـراد بـۆ بـاوکی، کە لە تفلـیس دەژیـا. زۆر زوو نـامەکەی نووسی و بە پەلە گەڕایەوە بۆ ژووری میوانداری، نەوەک ژنەکەی لێـی دڵمەنـد و تـووڕە بـێ کە ئەوی لەگەڵ غەریبەیەکـی ترسـناک بەجێهێشـتووە. غەوارەیەک کە لە لایەکەوە نـابێ بێڕێزیـی پێبکـرێ و لە

لایەکیشەوە نابێ زۆر بە خۆشەویستی و مێهرەبانییەوە ڕەفتاری لەگەڵ بکەن. حاجی مراد لە سەر کورسییەک دانیشتبوو و و کوڕە قژ سوورەکەی ڤۆرۆنتسۆڤ لە سەر کۆشی دانیشتبوو و بە وردی گوێی بۆ دیلمانجەکە ڕاگرتبوو کە وەتەکانی حاجی مرادی پاچڤە دەکردەوە.

لەگەڵ هاتنە ژوورەوەی شازادە، حاجی مراد لە جێی خۆی هەستا و کوڕەکەی لە سەر کۆشی لابرد. بزەکەی سەر لێوی نەڕەوییەوە و بە شێوەیەکی جیددی ڕاوەستا و هەتا ڤۆرۆنتسۆڤ دانەنیشت، ئەو هەروا بە پێوە بوو.

لەگەڵ ماریا ڤاسیلییۆڤنا درێژەی بە ئاخافتنەکەی دا و گوتی داب و نەریتی خەڵکی ئەوان ئەوەیە ئەگەر دۆستێک شتێکی تایبەتی ئەوی دیت و بە دڵی بوو، دەبێ بە دیاری بیداتێ: «ئێستا کوڕەکەت دۆستی منە» دەستی بە سەری کوڕەکەیاندا هێنا.

ماریا ڤاسیلییۆڤنا بە مێردەکەی گوت: «ئەم دۆستە ڕێگرەی تۆ زۆر مرۆڤێکی لە دڵا شیرینە! کوڕەکەم حەزی لە خەنجەرەکەی بوو و تاریفی کرد، ئەویش لە ڕێوە پێشکەشی کرد.

کوڕە خەنجەرەکەی پیشانی باوکی دا و گوتی دەبێ زۆر گرانبایی بێ. باوکی لە وڵامیدا گوتی: «دەبێ ئێمەش لە دەرفەتێکدا دیارییەکی باش بە ئەو بدەین.

حاجی مراد دیسان دەستی بە قژە سوورەکەی کوڕەکەیاندا هێنا و گوتی: «دەبێتە پیاوێکی مەزن.»

ڤۆرۆنتسۆڤ خەنجەرەکەی لە کالان دەرهێنا. چاوی لە تیفە تیژەکەی کرد و گوتی: «زۆر سپاس بۆ ئەو دیارییە بە نرخەت.» داوای لە دیلمانجەکە کرد لێی بپرسێ چ خزمەتێکی پێویستە بۆی ئەنجام بدرێ؟ حاجی مراد لە وەڵامدا گوتی پێویستیی بە هیچ شتێک

نییە. ئەگەر دەکرێ دەیەهەوێ بچێتە ژوورێکی خەڵووت و نوێژ بکات. ڤۆرۆنتسۆڤ بانگی پێشخزمەتەکەی کرد و داخوازییەکەی حاجی مرادی پێگوت.

حاجی مراد کاتێک چووە ئەو ژوورەی کە نابوویانە ئیختیاری، خەمێک دایگرت و پەشۆکا. بزە و مێهرەبانی لە سەر ڕوخساری پەڕی و دڵەخورپە و نیگەرانی جێگاکەی گرتەوە. ڤۆرۆنتسۆڤ زیاتر لەوەی کە حاجی مراد چاوەڕوانیی دەکرد ڕێزی بۆ دانا و میوانداریی لێکرد. بەڵام هەر چی زیاتر و باشتر ڕێزیان بۆ دادەنا و خۆشەویستییان بۆ دەردەبڕی، ئەو زیاتر متمانەی بە ڤۆرۆنتسۆڤ و ئەفسەرەکان نەدەما. لەوە دەترسا قۆڵبەستی بکەن، زەنجیری لە قاچ بخەن و بینێرن بۆ سیبیریا، یان بیکووژن؛ هەر بۆیە زۆر وریا و لە سەر هەست بوو. کاتێک ئیلدار هاتە ژوورەکەی، لەڕێوە حاجی مراد لێی پرسی هاوڕێکانیان بۆ کوێ بردوون؟ یان چەکەکانیان لێ ساندوون؟ ئەسپەکانیان لە کوێیە؟ ئیلدار گوتی ئەسپەکان لە یەخترمەخانەی شازادە بەستراونەوە. چەکەکانیان لە هاوڕێکانی نەساندووە و خواردن و چاییان پێداون؛ دیسان دڵی نەحەسایەوە و بە شک و گومانەوە سەری لەقاند. دوای دەستنوێژ گرتن و نوێژ کردن داوای لە ئیلدار کرد خەنجەرە زێوینەکەی بۆ بێنێ. پاشان جلوبەرگی لە بەر کرد و پشتوێنەکەی بەست و خەنجەرەکەی لە بەر پشتوێنەکەی ناو چوارمەشقی لە سەر قەنەفەکە دانیشت و چاوەڕێ بوو بزانێ چی ڕوودەدا.

سەعات چوار دیلمانجەکە هات. داوای لێکرد بۆ خواردنی نیوەڕۆ بچێت بۆ لای شازادە. تۆزێ برنجی لەو شوێنەی دەفرەکە تێکرد کە ماریا ڤاسلییۆڤنا تێیکردبوو. ماریا بە مێردەکەی گوت: «وا دیارە

دەترسێ دەرمانداوی بکەین. ڕاست لەو شوێنەی دەفرەکە برنجی تێکرد کە من بۆ خۆمم تێکرد.»

پاشـــان ڤۆرۆنتســـۆڤ ڕووی لە دیلمـــانجەکە کـــرد و پرســـیاری لە حاجی مراد کرد کاتی نوێژی دواترتان کەنگێیە. حاجی مراد پێنج قامکی هەڵێنا و ئاماژەی بە خۆرەتاو کرد. ڤۆرۆنتسۆڤ گوتی کەوایە زۆری نەماوە. کاتژمێرە باخەڵییەکەی لە گیرفانی دەرهێنا. قورمیشی کرد. زەنگی سەعات چواری لێدا. حاجی مراد پێی سەیر بوو. ویستی دیسان گوێی لە زەنگەکەی بێ. ڤۆرۆنتسۆڤ کاتژمێرەکەی دایە دەستی چاوی لێ بکات.

شازادە خانم بە مێردەکەی گوت: «وا دیارە زۆر دەرفەتێکی باشە بۆ قەرەبوو کردنەوەی دیارییەکەی.»

ڤۆرۆنتسۆڤ کاتژمێرەکەی پێشکەشی حاجی مراد کرد. حاجی مراد دەستی لە سەر سینگی دانا و دیارییەکەی قەبووڵ کرد. چەند زەنگی پێ لێدا و بە نیشانەی ڕەزایەت سەری لەقاند.

دوای خواردنی فراوێن ڕایانگەیاند کە یاوەری میلێر زاکوملسکی هـــاتووە. یـــاوەر شـــازادەی ئاگـــادار کـــرد کە ژینـــڕاڵ هەواڵـــی خۆبەدەستەوەدانی حاجی مرادی پێگەیشتووە و لەوەی ئەم کارە بە بێ ئاگادارییی ئەو ئەنجام دراوە زۆر دڵتەنگ و تووڕەیە. چاوەڕوانە هەر چی زووتر حاجی مراد ببەن بۆ لای ئەو. ڤۆرۆنتسۆڤ گوتی کە فەرمانی ژینڕاڵ جێبەجێ دەکرێ. داوای لە دیلمانج کرد حاجی مراد ئاگادار بکات کە دەبێ لەگەڵ ئەوان بچێت بۆ لای ژینڕاڵ.

ماریا ڤاسلییۆڤنا کاتێک لە قسەکانی یاوەر ئاگادار بوو، بۆی دەرکەوت بارودۆخەکە ئاڵۆزە. لەوانەیە کێشەیەک لە نێوان ژینڕاڵ و

مێردەکەیدا ساز بێ. سەرەڕای دژایەتیی مێردەکەی بڕیاری دا لەگەڵیان بچێت بۆ لای ژینراڵ.

مێردەکەی گوتی: «ئەو کارە پێوەندیی بە منەوە هەیە. وا باشە تۆ خۆتی تێوەنەدەی و لە ماڵێ بمێنییەوە.»

خانمیش گوتی: «من دەمهەوێ چاوم بە خێزانی ژینراڵ بکەوێ و ئەویش هیچ پێوەندییەکی بە جەنابتانەوە نییە.»

«دەتوانێ خۆت لە کاتێکی دیکەدا بچی.»

«نا، هەر ئێستا دەمهەوێ بچم.»

لە کەلی شەیتان نەدەهاتە خوارێ. ڤۆرۆنتسۆڤ بە ناچاری ڕازی بوو. هەر سێکیان وەڕێ کەوتن.

کاتێک گەیشتن، ژینراڵ خاکەڕایانە و بەڕێزەوە ماریا ڤاسلییۆڤنای برد بۆ لای ژنەکەی و بە یاوەری گوت حاجی مراد ببات بۆ ژووری چاوەڕوانی و هەتا ئەو کاتە فەرمانیان پێدەکا، لەوێ بمێنێتەوە.

دەرگای ژوورەکەی خۆی کردەوە و بە شازادەی گوت: «فەرموو.»

کە چوونە ژوورەوە بێ ئەوەی خولکی ڤۆرۆنتسۆڤ بکات لە سەر کورسییەک دانیشێ، هەر وا بە پێوە گوتی: «فەرماندەری ئێرە منم. کەوایە هەر چەشنە دانوستانێک لەگەڵ دوژمن دەبێ لە لایەن منەوە ئەنجام بدرێ. بۆ چی پێت ڕانەگەیاندم کە حاجی مراد هاتووە و دەیهەوێ خۆی بە دەستەوە بدات؟»

ڤۆرۆنتسۆڤ وەڵامی دایەوە: «نوێنەرێکی هات و گوتی حاجی مراد تەنیا بەو مەرجە خۆی بە دەستەوە دەدا و دێتە ڕیزی هێزەکانی ئێمەوە کە خۆی تەسلیمی من بکات.» ڕەنگی بزرکابوو. ئەو هەڵسوکەوتە توند و لووتبەرزانەیەی ژینراڵ شڵەژاندبووی و

تووڕەیییەکەی ژینڕاڵ کاردانەوەی لە سەر ئەویش هەبوو. هەر بۆیە ڕقی هەستا و سوورهەڵگەڕا.

بارۆن چاوی لە چاوی ڤۆرۆنتسۆڤ بڕی و دەنگی هەڵێنا:

«دەڵێم بۆ چی ئەو هەواڵە گرنیگەت پێ ڕانەگەیاندم؟»

«بارۆن، دەمویست پێت ڕابگەیێنم.»

«لەمەولا بە من مەڵێ بارۆن! بلێ جەنابی ژینڕاڵ!»

بارۆن ڕقەکەی کەلاوڕێژی کرد و لە ناکاو ئەوی بە دەمیدا هات گوتی و پێی لێهەڵبڕی:

«من بیست و حەوت ساڵە خزمەت بە وڵات و تێزار دەکەم، قەت ڕێگە نادەم هەرزەکارێکی دەمڕووت و ژێر دەستی خۆم، بە پشتیوانیی کەسوکار وماڵباتەکەی، هێندە چاوقایم بێ گوێ بە پلەوپایە و فەرمانەکانی من نەدات و خۆی بکاتە کەوچک بە دەست. یان خۆی لە کار و بارێک هەڵقوتێنێ کە هیچ پێوەندییەکی بە ئەوەوە نییە و...

ڤۆرۆنتسۆڤ قسەکەی پێ بڕی و گوتی:

«جانەبی ژینڕاڵ! تکایە هێندەی پێ لێ هەڵمەبڕە و هێندێکی تێدا بهێڵەوە. داواشت لێدەکەم شتێک نەڵێی کە بە پێچەوانەی ڕاستییەکانە.»

«ژینڕاڵ تووڕەتر بووبوو، بە ڕقەوە لێوی خۆی دەکورۆشت و سوورهەڵگەڕابوو؛ گوتی: «ئەوەی من دەیڵێم ڕاستە و ڕێگە نادەم...» بەڵام لەو کاتەدا ماریا ڤاسیلییۆڤنا بە تەشک و داوێنی شلْپ و شۆڕەوە لەگەڵ ژنێکی گەڕاوە کە خێزانی ژینڕاڵ بوو، هاتنە ژووریَ.

ماریا ڤاسیلییۆڤنا گوتی: «بارۆن، سیمۆن قەستی ئەوەی نەبووە بێ ڕێزی بە ئێوە بکات.»

«شازادە خانم خۆ مەبەست ئەوە نییە...»

«باشـه، وا باشـه واز لەو باسـە بێـنن! نەتبیسـتووە دەڵـێن ئاشـتیی خراپ لە شەڕی باش چاکترە؟ خودایە گیان خۆشم نازانم دەڵێم چی.»

ماریا دەستی کرد بە پێکەنین.

ژینڕاڵی توورە و تۆسن، پێکەنینی شیرین و دڵڕفێنی شـازادە خـانمی شۆخوشەنگ خاوی کردەوە و دڵی نەرم بوو. بسکەی سمێڵی هـات و سەری داخست.

ڤۆرۆنتسۆڤ گوتی: «دانی پێدادەنێم هەڵەم کرد.»

میلێر گوتی: «منیش لە خۆڕا بە کەوچکە ئاوێک کەوتمە مەلە.»

چووە پێشێ و تەوقەی لەگەڵ شازادە خانم کرد.

بڕیاریان دا حاجی مراد بە شێوەی کاتی لە لای ژینـڕاڵ بمێنێتەوە و پاشان بینێرن بۆ تفلیس و ڕادەستی فەرماندەری باڵی چەپی بکەن.

حاجی مراد لە ژوورەکەی تەنیشت دانیشتبوو. نەیدەزانی باسـی چـی دەکەن، بەڵام دەیزانـی سـەبارەت بە ئەو قسـە دەکەن. حەزی دەکـرد بزانـێ باسـی چـی دەکەن. دیزانـی جیـابوونەوەی ئەو لە شـامیل بـۆ ڕووسەکان زۆر گرنیگە. بۆی دەرکەوت دەمەتەقێ و مشتومڕەکەیان لە سـەر ئەوە. دەیزانی ڕووسـەکان نەک نـایکوژن بەڵکوو خواستەکانیشـی وەدیدەهۆێـنن. دەشـیزانی کە میلێـر و زاکۆمسـلکی سـەرەڕای ئەوەی ژینڕاڵێکـی گەورەیە و ئەفسـەرێکی پـایەبەرزی ئەرتەشـە، بەڵام بە قەد ڤۆرۆنتسـۆڤی ژێـر دەسـتی دەسـەڵاتی نیـیە و لە حکوومەتـدا دەسـتی نـاڕوا؛ هەر بـۆیە گرینـگ ڤۆرۆنتسـۆڤە نەک ژینـڕاڵ. هەر بـۆیە کاتێـک ژینڕاڵ فەرمانی دا بیبەن بۆ ژوورەکەی و پرسیاری لێکرد، لـووتبەرزانە وەڵامی دایەوە و گوتی لە کوێستانەوە بە پێی خۆی هـاتووە بۆ ئەوەی خـزمەت بە تێزار بکـات. تەنیـا لەگەڵ سـەردار یـانی فەرمانـدەی گشـتی شازادە ڤۆرۆنتسۆڤی پیر لە تفلیس دانووستان دەکات.

## حەوت

ئاڤدێڤیان بە برینداری گەیاندە خەستەخانە: بینایەکی چێوینی چکۆڵە بوو و لە نزیک دەروازەی قەڵاکە هەڵکەوتبوو. لە سەر تەختێکی بەتاڵی بەشی گشتی خەواندیان. ئەو بەشە چوار نەخۆشی لێبوو. یەکیان گرانەتای گرتبوو و تاویاوێکی قورسی هەبوو. ئەوی دیکەیان نۆبەتێی گرتبوو، ڕەنگی بزرکابوو و بەر چاوی شین بووبۆوە. دەترسا دیسان چەقوچۆ دایگرێ و لەپەستا باوێشکی دەدا. دوو کەسەکەی دیکەش لە شەڕی دوو حەوتوو لەمەوبەردا بریندار بووبوون. یەکیان دەستی بریندار بووبوو و ئەوی دیکەشیان شانی. ئەوەی شانی بریندار بوو لە سەر تەختەکە دانیشتبوو. هەموویان جگە لەو نەخۆشەی کە گرانەتای گرتبوو، برینداره تازە هاتووە کەیان دایە بەر لێشاوی پرسیار.

یەکێک لەو کەسانەی کە ئاڤدێڤی هێنابوو گوتی:

«هێندێ جار گولله وەک باران دەبارێ، بەڵام هیچ کەس ناپێکرێ. ئەمجارەیان تەنیا پێنج «شەش تەقەیان کرد و... »

«بەخت و ناوچاوانەکەت چۆنی هێنابێ هەر ئەوەیە و ناتوانی لێی دەرباز بی.

کاتێک ویستیان ئاڤدیڤ لە سەر قەرەویلەکە ڕاکێشن لە بەر ژان و ئـازاری بـرینەکەی هـاواری دەکـرد. بەڵام کاتێـک ڕایانکێشـا، ئـوقرەی گرت و ئیتر بێدەنگ بوو. بەڵام نێوچاوانی گرژ کردبوو و بەردەوام قاچی دەجووڵاندەوە. دەستی لەسەر برینەکەی زگی دانا بوو و چاوی لە پێش خۆی بڕیبوو.

پزیشـک هـات. دەسـتووری دا ئاڤـدیڤ وەرگێـڕن، بـۆ ئەوەی بزانـێ گوللەکە دیوادەر بووە یان نا، ئاماژەی بە جێگە برینەکانی سەر پشـتی ئاڤدیڤ کرد و گوتی: «ئەوە چییە؟»

ئاڤدیڤ گوتی: «قوربان ئەو هی ساڵانی ڕابردووە.»

جێی قەمچی بوو کە چەند ساڵ لەمەوبەر لێیان دا بوو.

ئاڤدیڤیان وەرگێڕایەوە و لە سـەر پشـت ڕایانکێشـا. پزیشـکەکە نێو بـرینەکەی پشـکنی و ئـاخری گـوللەکەی دۆزیـیەوە، بەڵام نەیتـوانی دەریهێنـێ. مەڵحەمـی لە سـەر بـرینەکە دامنـا، بەسـتی و لە ژوورەکە چووەدەرێ. لە تەواوی ئەو ماوەیەدا کە پزیشکەکە بۆ گوللەکە دەگەڕا و مەڵحەمـی لە سـەر بـرینەکەی دانـا و پێچـای، ئاڤـدیڤ چـاوی قووچانـدبوو و تونـد ددانـی بە یەکدا نـابوو. دوای ڕۆیشـتنی پزیشـک چـاوی هەڵێنـا. بەسەرسـووڕمانەوە لە دەور و بەری خـۆی ڕوانـی و چـاوی بە نەخۆشـەکانی دیـکە کەوت. چـاوێکی لە یاریـدەری پزیشـکەکەش کـرد. بەڵام دەتگـوت نایـانبینێ. لە شـتێک سـەری سووڕمابوو.

هاوڕێکـانی پـانۆڤ و سـێرۆژین[27] هـاتنە ژووری. بەڵام ئاڤـدیڤ هەروا لە سـەر گـازەرای پشـت ڕاکشـا بـوو و بە واقوڕمـانەوە

27- Serogin

دەیڕوانی. ماوەیەکی پێچوو هەتا هاوڕێکانی ناسییەوە. بەڵام دیسان دەتگوت نایانبینێ و هەروا ماق مابوو.

پانۆڤ لێی پرسی: «پیتێتر ئاڤدیڤ، پەیامێکت نییە بینێرم بۆ بنەماڵەکەت؟»

ئاڤدیڤ ئەگەرچی چاوی لە چاوی پانۆڤ بڕیبوو بەڵام وەڵامی نەدایەوە.

پانۆڤ دەستە ڕەقەڵ و ساردوسڕەکانی ئاڤدیڤی گرت و دیسان لێی پرسی: «پەیامێکت نییە بۆ کەسوکارەکەتی بنێرم؟»

ئاڤدیڤ وەک ئەوەی لە خەو ڕاپەڕبێ؛ گوتی:

«ئا!، پانیڤ! ئەوە تۆی؟»

«بەڵێ خۆمم. هاتم بۆ سەردانت. پەیامێکت نییە بۆ ماڵێ؟ مێرۆژین خۆی نامەکەت بۆ دەنووسێ.»

ئاڤدیڤ بە بێوازییەوە چاوی لە سێرۆژین کرد و گوتی: «نامە دەنووسی؟ کەوایە بنووسە کوڕەکەت پێترۆخا لە خودا دەپاڕێتەوە ژیانێکی خۆش و پڕ بەختەوەریتان هەبێ. ئەمڕۆ پێمگوتن کە ئێرەیی بە براکەم دەبەم، بەڵام ئێستا خۆم دڵخۆشم. خەبەری ناخۆشیان مەدەنێ. لێیانگەڕێن با ژیانی خۆیان ڕابوێرن و نیگەران نەبن. لە خودا دەپاڕێمەوە حاڵیان باش بێ. من ڕازیم و هیچ کێشە و گرفتێکم نییە. ئەوە بنووسە.»

دوای ئەو قسانە بێدەنگ بوو. چاوی لە پانۆڤ بڕیبوو. لە ناکاو لێی پرسی: «پیپەکەت دۆزییەوە؟»

پانۆڤ وەڵامی نەدایەوە.

ئاڤدیڤ دووپاتی کردەوە: «پیپەکەت دەڵێم، پیپەکەت لێون بووبوو دۆزیتەوە؟»

«بەڵێ دۆزیمەوە لە نێو جانتاکەمدا بوو.»

ئاڤدێڤ گوتی: «زۆر باشە. ئێستا مۆمێکم بدەنێ با بە دەستمەوە بیگرم. خەریکە دەمرم.»

لەو کاتەدا پۆلتۆراتسکی هات بۆ لای و گوتی: «چۆنی کوڕم؟ حاڵت باش نییە؟»

ئاڤدێڤ چاوی قووچاند و بە نیشانەی نکووڵی سەری هەڵتەکاند. ڕەنگی ڕوخساری هەڵبزڕکا بوو، بێ تاقەت بوو. وەڵامی نەدایەوە.

بەڵام دیسان بە پانۆڤی گوت:

«مۆمێکم بۆ بێنە. خەریکە دەمرم.»

مۆمێکی باریکیان دایە دەستی. نەیدەتوانی مۆمەکە ڕاگرێ. توند لە مشتی گرت. پۆلتۆراتسکی ڕۆیشتە دەرێ. پێنج خولەک دواتر یاریدەری پزیشک سەری نا بە سینگی ئاڤدێڤەوە و گوتی: «تەواو بوو، خودا لێی خۆشبێ.»

ڕۆژی دواتر مەرگی ئاڤدێڤیان لە بەیاننامەی ئەرتەشدا بەم شێوەیە ڕاگەیاند:

«بیست و سێهەمی نۆڤامبر دوو مەفرەزە لە لیوای کوورین[٢٨] بۆ بڕینی دار چوون بۆ دارستان. نزیک نیوەڕۆ لە لایەن تاقمێکی زۆر لە شەڕخوازانی کوێستانەوە هێرشیان کرایە سەر، مەفرەزەی دووهەم بە سەر نێزەوە هەڵیانکوتایە سەریان و لەم شەڕ و پیکدادانەدا دوو کەس لە سەربازەکان بریندار بوون، لە ئاکامدا یەکیان بەهۆی قورس بوونی برینەکەیەوە گیانی لە دەست دا. نزیکەی سەد کەسیش لە شەڕخوازە هێرشکەرەکان کوژران و بریندار بوون.»

---

28- Kurin

## هەشت

ئەو ڕۆژەی کە پیتێر ئاڤدیڤ لە نەخۆشخانە کۆچی دوایی کرد، باوکە پیرەکەی لەگەڵ ژنی ئەو برایەی کە ئاڤدیڤ بە جێی ئەو سەربازیی دەکرد و کچە جحێڵەکەیان کە کاتی شوو کردنی بوو، خەریکی لاتیل کردنی کڵۆشی جۆ بوون لە سەر خەرمانە بەستەڵەکەکە.

شەوی ڕابردوو بەفرێکی قورس بارییبوو و بەری بەیانی تۆفوبەند بوو و تفت هەڵاویشتبایە دەیبەست. پیرەپیاو کاتێک کەڵەشێر سێهەم جار خوێندی، لە خەو هەستا. لە پشت شووشەی بەستووی پەنجەرەکەوە. چاوی بە مانگەشەو کەوت. لە سەر تەنوورەکە هاتە خوارێ و کەڵپۆسەکەی لە بەر کرد. کڵاوەکەی لە سەر نا و ڕۆیشت بۆ سەر خەرمانەکە. دوای دوو سەعات کارکردن گەڕایەوە بۆ ماڵێ. کوڕ و بووکەکەی لە خەو هەستاند. بووکەکەی و کچەکەی کاتێک گەیشتنە سەر خەرمانەکە، دیتیان بە جوانی گەسک دراوە. بێڵ و وەروەری لە بەفرەکە چەقاندبوو. لە پاڵ ئەویشدا گەسکی گەزیچار لقەکانی بۆ سەرێ هەڵگەڕابوونەوە. باقەی جۆ بە لۆدە لە سەر خەرمانەکە ڕیز کرابوون و ئامادە کوتان و گێرە کردن بوو. جەنجەڕە دەستییەکانیان هەڵگرت و دەستیان کرد بە ورد کردنی کڵۆشەکە. پیرەپیاو جەنجەڕە قورسەکەی بە

سەر کڵۆشـەکەدا دەگێڕا و وردی دەکرد. کچەکەی بە شـەنە قەراغـی بۆ تێدەکردەوە. بووکەکەشی بە پەیاغێک لە بەرەوە دەیکوتایەوە.

مانـگ ئـاوا بووبـوو. سـپێدە وڵاتـی زێوئـاژن کـرد بـوو و کڵۆشــەکە خەریک بوو ورد دەبوو کە کوڕە گەورەکەی، ئاکیم[29] کەلپۆس لە کۆڵ و کڵاو لە سەر هات بۆ لایان.

پیرەپیاو ڕاوەستا، پاڵی بە جەنجەڕەکەوە دا و دەنگی هەڵبڕی:

«تا ئێستا بە ملی شکاوت لە کوێ بووی؟»

«خەریکی تاقەت کردنی ئەسپەکان بووم.»

ـ«خەریکـی تـاقەت کردنـی ئەسـپەکان بـووم!» دەمەلاسـکەی کـردەوە. «ئەوە کـاری پڕوپیرێژنــانە. وەرە ئەو جەنــجەرە لێخــوڕە دەی! هەتیــوە خوێڕییەی ئارەقخۆرە، تەنیا لە بیری زگ لەوەڕاندن دایە!»

کوڕە لە بنەوە بۆڵاندی: «بۆ قسەم پێ دەڵێی؟»

باوکی بە تووڕەیییەوە گوتی: «چیت گوت؟»

کوڕە بێ ئەوەی وەڵامـی بـاوکی بداتەوە دەستی دا جەنجەڕەکە و بە سـەر کڵۆشـەکەدا گێڕای. پیرەپیـاو چـاوی لێکـرد و گـوتی: «چـاوی لـێکە، ملــی تەور نــایبڕێ! منــیش وەهــا کــز بــووم پــانتۆڵەکە بە نێـوقەدمەوە گیرنابێ!»

گێــرە کــردن تەواو بــوو. ژنەکــان بە شـــەنە خەریکــی هەڵــدانەوەی خۆیانەکە بوون.

پیرەپیـاو لەبەر خـۆیەوە دەیبۆڵانـد: «پێترۆخـا خـۆی گەوج کـرد و بە جێی تۆ چوو بۆ سەربازی. بریا خۆت بچووبـایەی جـا ئەو کـاتە دەمزانـی

---

29- Akim

چۆن دەتکەنە بنیادەم! ئەو لە ماڵێ بووایە بە قەد پێنج کەسی وەک تۆ کاری دەکرد. داوەشێی.»

بووکەکەی لەگەڵ ئەوەی خەریکی کردنەوەی خامووتی جەنجەڕەکە بوو گوتی:

«مامە گیان، تکایە بەسی کەن!»

«شەش کەس نانخۆر و جێگر، بە هەموویان بە قەد یەک کەس کار ناکەن! پێترۆخا دوو هێندەی ئێوە کاری دەکرد. ئەو کوا وەک ئێوە بوو!:

دایکی ئاڤدێڤ لە لای ماڵێوە هات. پەڕۆی لە کەوشەکانی پێچا بوو بۆ ئەوەی نەخزێ. بەفرەکە لە ژێر پێیدا کرپەی دەهات. پیاوەکان باقە گێرە نەکراوەکانیان لە سەر یەک هەڵدەچنی؛ بووک و کچەکەش دەوری خۆیانەکەیان گەسک دەدا.

ژنە هاتە پێشێ و گوتی: «گزیر دەستووری داوە هەمووان بچن بۆ سەر کاری ئاغا. دەبێ بچن بۆ خشت پێژان. ناشتایی ئامادەیە، وەرن نانەکەتان بخۆن.»

پیرەپیاو بە ئاکیمی گوت: «قەیناکە، ئەسپە ئەبڵەق هەوسار کە و بڕۆ. بەڵام وریابە وەک جاری پێشوو دەردەسەریم بۆ ساز نەکەی. قەزای پێترۆخات لێکەوێ!»

ئاکیم بە تووڕەیی گوتی: «ئەویش لێرە بوو وەک من دەردت پێدەدا، ئێستا دوورە بۆیە لە بەر چاوت شیرین بووە و داخی خۆت بە من دەڕێژی!»

دایکی بە لەبزێکی توند و تووڕەوە گوتی: «باوکت ڕاست دەکا؛ تۆ هیچکات وەک پێترۆخات پێناکرێ.»

«باشە باش، دەستم لێهەڵگرن.»

«ئێستا کە زگت تێر بووە دەڵێی باشە باش!»

بووکەکەیان هەڵیدایە و پەڕییە نێو قسەکانیان: «باشە بەسی کەن، ئێوە بۆ نازانن بێ قرە کار بکەن؟!»

ماوەیەکی زۆر بوو باوک و کوڕکێشەیان لە بەیندا بوو. لەو کاتەوە پێترۆخا بە ویستی خۆی و خۆبەخشانە بڕیاری دا بە جێی براکەی بچێت بۆ سەربازی. کێشەکە دەستی پێکرد. پیرەپیاو پێی وابوو هەڵۆیەکی داوە و قاژوویەکی بە جێی ئەو وەرگرتووە. هەڵبەت ئەوەشی دەزانی کە باشتر وایە ئەو برایەی کە نداڵی نییە بە جێی برا خاوەن ژن و منداڵەکەی بچێت بۆ سەربازی. ئاکیم چوار منداڵی هەبوو، بەڵام پێترۆخا منداڵی نەبوو. ئەو وەک باوکی ئازا و بە کار و زەحمەتکێش بوو؛ زۆر بە تاقەت و شارەزا و سەرەڕای ئەوانەش سەبوور بوو. کاتێک بە شوێنیکدا تێدەپەڕی و دەیدی کەسێک خەریکی کارە، دەستەوبەجێ دەچوو بۆ یاریدەی، باوکیشی هەروا ڕۆحسووک بوو. دروێنەی دەکرد؛ کۆڵی دەکێشا؛ داری دەبڕی؛ ئێزنگی دەشکاند؛ لەو سەردەمەدا چوونە سەربازی بەرانبەر بوو لەگەڵ مەرگ. کەسێک کە دەچوو بۆ سەربازی، وەک لقەدارێک وابوو کە دەشکێتەوە و گێژەڵووکە ڕایدەماڵێ. پیرەپیاو هەر کاتێک پێترۆخای وەبیر دەهاتەوە کزە لە جەرگییەوە دەهات. زۆر جار وەک ئەمڕۆ باسی دەکرد و تاریفی بە کاری و ماندوویی‌نەناسیی پێترۆخای دەکرد بۆ ئەوەی کوڕە گەورەکەی غیرەتی ببزوێ. دایکیشی بۆ ساتێکیش کوڕە سەربازەکەی لە بیر نەدەچۆوە و هەمیشە لە بەر چاوی بوو. ماوەیەکی زۆر، نزیکەی ساڵەوەختێک بوو داوای لە مێردەکەی دەکرد هێندێک پارەی بۆ بنێرێ، بەڵام پیرەپیاو پێمل نەدەبوو و هەر جاری بیانوویەکی دەهێنایەوە.

بنەماڵەی ئاقدێڤ زۆریش دەسکورت نەبوون. پیرەپیاو بڕێ پارەی پاشەکەوت کردبوو، بەڵام دەستی لە دڵی نەدەبۆوە لێی خەرج بکات.

ئەمڕۆش کە باسی کوڕە سەربازەکەیان هاتە گۆڕێ ژنە دیسان بڕیاری دا داوا لە مێردەکەی بکات دوای فرۆشتنی جۆیەکە، لانیکەم یەک ڕۆبڵێ بۆ بنێرێ.

کاتێک گەنج و لاوەکان چوون بۆ بێگاریی ئاغا و پیرەکان مانەوە، ژنە دەستی کرد بە پاڕانەوە. دوای ئەوەی نەوەدوشەش بووشل[30] جۆی شەن و کەو کراویان کردە گوێنییەوە و خستیانە سەر کاشە، ژنە ئەو نامەیەی دایە دەستی مێردەکەی کە داوای لە نووسیاری کلیسا کردبوو بۆ کوڕەکەی بنووسێ و داوای لە مێردەکەی کرد یەک ڕۆبڵ بخاتە نێو پاکەتەکەوە و بە پۆستەدا بنێرن بۆ کوڕە سەربازەکەیان. مێردەکەی بەڵێنی دا هەرکە گەیشتە شار ئەو کارە دەکا.

پیرەپیاو کەڵپۆسی نوێی لە بەر کردبوو، بەلەکپێچی سپی و گەرمی لە قاچی بەستبوو. نامەکەی لە ژنەکەی وەرگرت و خستیە نێو جزدانەکەی باخەڵیەوە. دۆعایەکی خوێند و سواری کاشەکە بوو. لە شاری داوای خاوەنی مسافیرخانەکە کرد نامەکەی بۆ بخوێنێتەوە، بەوردی گوێی بۆ ڕاگرت و دەقی نامەکەی بە دڵ بوو.

دایکی پێترۆشکا[31] سەرەتا دۆعا و سڵاوی بۆ نووسیبوو. لە زمانی هەموانەوە سڵاوی گەیاندبوو. هەواڵی مەرگی باوەگەورەی پێدابوو. نووسیبووی ئاکیسنیای[32] ژنی لە لای ئەوان نەماوە و چووە بۆ شوێنێک و بۆتە کڵفەت، بەڵام زۆر بە پاکی و ڕووسووری و حەیاوە کار دەکات و قسەی نەهاتۆتەوە سەر. ئاماژەی بەو یەک ڕۆبڵەش کردبوو کە بڕیار بوو مێردەکەی بیخاتە نێو پاکەتەوە. لە کۆتایی نامەکەدا ژنە ئیختیاری لە

30- Bushel پێوانەی دانەوێڵە نزیکە سی و شەش کیلۆ.

31- Petrushka

32- Aksinya

دەست دابوو و داوای لە نووسیاری کلیسا کرد بوو وتەکانی وشە بە وشە بۆ کوڕەکەی بنووسێ:

«کوڕە خۆشەویستەکەم، شتێکی تر، کۆترە جوانەکەم. پیترۆشکا گیان! هێندە لە دووریی تۆ گریاوم سۆمایی لە چاوانم بڕاوە. زۆر بیرم کردووی و بێ تۆ ژیانم لێ تاڵ بووە. بۆ چی بە تەنیا جێت هێشتم و ڕۆیشتی؟» کە گەیشتبووە ئێرە، ژنە دابووی لە پڕمەی گریان و گوتبووی: «هەر ئەوەندە بەسە.» نامەکە نووسرا، بەڵام مەرگ مەودای نەدا پیترۆشکا نامەکە بخوێنێتەوە و پارەکە وەرگرێ، یان لە حاڵ و ژیانی ژنەکەی ئاگادار بێ و دوایین قسەکانی دایکی ببیستێ.

دوای ماوەیەک نامەکە و یەک ڕۆبڵەکەی لە نێویدا بوو گەڕایەوە و هەواڵی هێنا بوو کە پیترۆشکا لە شەڕدا گیانی لە دەست داوە: «ئاڤدیڤ گیانی خۆی لە پێناوی تێزار و وڵات و کلیسای ئۆرتۆدۆکسدا کردۆتە قوربانی.»

کاتێک ئەو هەواڵە گەیشت دایکی ئاڤدیڤ ئەوەندەی توانیی گریا. پاشان خۆی بە کار و بارەوە سەرقاڵ کرد. ڕۆژی یەکشەممەش چوو بۆ کلیسا. ڕێوڕەسمی پرسە و نزای بۆ کوڕەکەی دانا و نانی تەبەڕوکی بە سەر خەڵکیدا دابەش کرد، تاکوو بە یادی کوڕەکەی بیخۆن و دۆعای بۆ بکەن.

ئاکیسنیا بوو بە بێوەژن. لە پرسەدو تازیەباریی مێردەکەیدا زۆر گریا و هاواری کرد و لاڵایەوە کە تەنیا ساڵێک لەگەڵ مێردەکەی ژیاوە. گلەیی و سکاڵاشی لە مێردەکەی دەکرد کە بۆتە هۆی چارەڕەشی و تاڵ بوونی ژیانی و بۆ ئەوەی خۆشەویستی خۆی بۆ براکەی دەربڕێ، بە جێی ئەو چۆتە سەربازی و ژن و ژیانی خۆی بەجێهێشتووە و بە پێی خۆی چۆتە نێو گێژاوی مەرگەوە.

## نۆ

میخاییل سیمینۆڤیچ ڤۆرۆنتسۆڤ[٣٣] چونکە کوڕی باڵوێزی ڕووسیا بوو و لە بریتانیا بار هاتبوو، خاوەنی فەرهەنگی ئەورووپی بوو و لە نێوان ئەفسەرانی پایەبەرزی ئەو سەردەمەدا بێ وێنە بوو. پیاوێکی بەرزەفڕ و مەقام خواز، بەڵام هێدی و لەسەرەخۆ بوو. کاتی وێککەوتن لەگەڵ ژێر دەستەکانی زۆر بە نەرمی و خاکەڕایی ڕەفتاری دەکرد. کاتی بەرەوڕوو بوون لەگەڵ باڵا دەستەکانیش دەیزانی چۆن هەڵسوکەوت بکات. ژیان بە لای ئەوەوە فەرمان پێدان و فەرمانبەری بوو. بالاترین نیشان و پلەوپایەی وەرگرتبوو. وەک فەرماندەیەکی زیرەک چاوی لێدەکرا و تەنانەت ناپلیۆنی لە کریسنۆیە[٣٤] شکست دابوو.

ئێستا، کەساڵی 1853 یە، زیاتر لە حەفتا ساڵی تەمەن بوو، بەڵام لاوتری دەنواند. پیاوێکی توندوتۆڵ و گورجوگۆڵ بوو. لە هەموو ئەوانەش گرینگتر خاوەنی بیر و زەینێکی چالاک بوو کە لە جێی خۆیدا کەڵکی لێوەدەگرت و بەردەوام توانایی و خۆشەویستییەکانی لە زیاد بوون بوو. زۆر ساماندار بوو، ماڵ و سامانەکەشی تایبەتی

33- Michael Semenovich Vorontsov

34- Krasnoye

خــۆی و کــۆنتس برانیتســکیی[35] ژنــی بــوو. وەک جێگــری تێــزار مـووچەیەکی زۆری وەردەگـرت و بەشـێکی زۆر لە داهـاتی خـۆی بـۆ دروستکردنی کۆشک و باخێک لە ڕۆخـی باشـووری کەریمە تەرخـان کردبوو.

عەسـری ڕۆژی چـوارەمی دیسـامبری 1852 گالیسـکەیەکی سـێ ئەسـپەی تەتەر لە هەمـبەر کۆشـکەکەی ئەودا لە تفلـیس ڕاوەسـتا. ئەفسەرێک بوو کە توێژێکی تەپوتۆزی ڕێگا لێ نیشتبوو، پەیامێکی لە لایەن ژینڕاڵ کازلۆڤسکییەوە هێنا بوو کە حاجی مراد خـۆی تەسلیمی ڕووسـەکان کـردووە. ئەفسـەر گەیشـتە سەرسـەرا بەرینـەکە و بەبەر دەمـی پاسـەوانەکاندا تێـپەڕی. شـەکەت و مانـدوو بـوو و هەمـوو ماسـوولکەکانی لەشـی گیرابـوون. سـەعات شەشـی دوانیـوەڕۆ بـوو. ڤۆرۆنتسـۆڤ دەیویسـت بچێت بـۆ ژووری نـان خـواردن کە هەواڵـی گەیشـتنی تەتەرەکەیـان پـێ ڕاگەیانـد. لەڕێوە تەتەرەکەی بانـگ کـردە ژووری و پەیـامەکەی لێـوەرگرت. چەنـد خـولەک درەنگتـر چـوو بـۆ ژووری نان خواردن.

کاتێـک چـووە ژووری میوانـداری سـی کەس کە بانگهێشـتن کـرا بــوون لەگەڵ ئەو شــێو بخــۆن، لەگەڵ شــازادە خــانم ئیلیزابێــت کسـاویرییۆڤنا ڤۆرۆناسـۆڤا[36] دانیشـتبوون، چەنـد کەسـیش لە دەوری یەک و لە بەر پەنجەرەکە ڕاوەستا بـوون. کە هـاتە ژووری هەموویـان ڕوویــان تێکــرد. ڤۆرۆنتســۆڤ وەک هەمیشــە یۆنیفــۆرمی ڕەشــی ئەفســەریی لە بەر دا بـوو بەڵام ڤاکیسـل و پـاگۆنی بەسـەر شـانەوە

35- Branitcki
36- Elizabeth Ksaweryevna Vorontsova

نەبـوو؛ تەنیـا خـاچی سـپیی «نیشـانی سـێنت جـۆرجی» بە ملیـدا هەڵواسیبوو.

بزەیەکـی گەش نیشـتبووە سـەر دەموچـاوە تیفتـیفەدراوە ڕێـوی شێوەکەی. چاوی چکۆڵە کردەوە و لە ئامادەبووانی ڕوانی. بە هەنگاوی ورد و لەسـەرەخۆ هـاتە ژووری. داوای لێبـوردنی لە هەمـوو خانمەکـان کـرد کە وەدرەنـگ کەوتـووە. چاکوخۆشـیی لەگەڵ پیاوکـانیش کـرد و چـوو بۆ لای شـازادە خـانم مانانـا ئۆربێلیـانی[37] کە ژنێکـی بـاڵا بەرز و شۆخوشـەنگ و بەنـاز بـوو، بە جـوانییەکی ڕۆژهەڵاتییـانەوە و نـزیکەی چل و پێنج ساڵی تەمەن بوو. قۆڵی خسـتە قۆڵی و پێکەوە ڕۆیشـتن بۆ سـەر مێـزی نـان خـواردن. شـازادە خـانم ئیلیزابێـت کسـاویرییۆڤنا ڤۆرۆنتسـۆڤاش قۆڵی لە قۆڵی ئەفسـەرێکی سمێڵ بابڕی سـوور هـوول خست کە هـاتبوو چـاوی بە شـاری تفلیس بکەوێ. ئەمیـری گـورجیش قـۆڵی لە قـۆڵی کـۆنتس شـوئازۆل[38] خسـت کە هـاوڕێی شـازادە خـانم ڤۆرۆنتسـۆڤا بـوو. دوکتـۆر ئاندرێژیوسـکی[39] و یـاوەر و ئامـادە بـووانی دیـکەش لەگەڵ خانمەکانیـان یـان بە بێ هـاوڕێی خـانم بە دوای ئەوانـدا چوون بۆ سەر مێزەکە. پێشـخزمەت کە جلـی فەرمـی و مەلیلە دۆزی و کەلبەدوون کـراوی لەبەردابوو، کورسـیی میوانەکانی کێشـایە دواوە بۆ ئەوەی لە سـەر جێگاکەیـان دانیشـن. سـەر پێشـخزمەتیش بە ئەدەب و ڕێزەوە سووپی گەرمی بۆ کردنە نێو دەفرە زێوینەکانەوە.

ڤۆرۆنتسـۆڤ لە بەرێک لە سـەر کورسـییەکی نێوەڕاسـت دانیشـت و ژنەکەشـی بەرەوڕووی ئەو لەو بەری مێـزەکە دانیشـت. لای دەسـتە

---

37- Manana Orbelyani
38- Choiseuil
39- Andrejewski

ڕاستی ڤۆرۆنتسۆڤ، شازادە خانمی شوخوشەنگ ئۆرێبلیانی و لای دەستە چەپیشی ژنێکی کولمە سووری گورجی دانیشت کە بە هەموو چەشنە زێڕ و زەمبەرێک خۆی ڕازاندبۆوە و بەردەوام بزەی لە سەر لێو بوو.

ڤۆرۆنتسۆڤ لە وەلامی ژنەکەیدا کە سەبارەت بە تەتەرەکە پرسیاری لێکرد، گوتی:

"Excellentes, Chere amie! Simon a eude la chance!" [40]

پاشان ڕووی لە ئەفسەرەکان کرد و هەواڵی گەرمی خۆ بە دەستەوەدانی حاجی مراد «جەنگاورترین ئەندامی ڕێکخراوەی شامیلی بە دەنگی بەرز ڕاگەیاند و گوتیشی هەتا یەک ـ دوو ڕۆژی تر دەیهێنن بۆ تفلیس.

هەمووان «تەنانەت ئەو ئەفسەر و یاوەرانەی لە لای خوارووی مێزەکەش دانیشتبوون و سەرقاڵی قسە و باسی خۆیان بوون «بێدەنگ بوون و گوێیان شل کرد.

دوای ئەوەی وتەکانی ڤۆرۆنتسۆڤ کۆتایی هات، شازادە خانمێک کە شان بە شانی ئەفسەرە سوورهوولەکە دانیشتبوو لێی پرسی:

«جانابی ژینڕاڵ؛ تۆ تا ئێستا چاوت بەو حاجی مرادە کەوتووە؟»

«بەڵێ چەند جارم دیوە، شازادە خانم!»

---

٤٠- هەواڵێکی گرینگ ئازیزم! سیمۆنی کوڕت نێوچاوانەکەی هێناویەتی. (بە زمانی فەڕەنسی)

ژینرِاڵ گێڕایەوە کە دوای دەست بە سەرداگرتنی گێرگبێل[41] ساڵی 1843 چۆن ئەو حاجی مرادە هێرشی کردۆتە سەر لیواکەی عەمید زۆلۆتاخین[42] و ئەوی لە بەر چاوی ئەو کوشتووە.

ڤۆرۆنتسۆڤ لەوەی کە ژینرِاڵیش هاتۆتە نێو وتوێژەکەوە بسکەی سمێڵی دەهات. بەڵام لە ناکاو ڕەنگی تیکچوو و بە حاڵەتێکی ئاڵۆز و پەشۆکاوەوە چاوی لە سووچێک بڕی.

ژینرِاڵ کە بە گەرمی قسەی دەکرد، باسی دووهەم جاری بەرەوڕوو بوون لەگەڵ حاجی مرادی دەگێڕایەوە: «گەورەم! ئەگەر لە بیرت بێ ئەو حاجی مرادە بوو کە بۆسەی بۆ مەفرەزەی ڕزگاری نایەوە و...»

ئەوەی کە ژینرِاڵی سوورهوول وەک مەفرەزەی ڕزگاری باسی دەکرد، داستانی خوێناویی دارگۆ[43] بوو کە لەو تێکهەلچوونەدا لیوایەکی تەواو تەفروتوونا بوون. ئەویش ئەو مەفرەزەیە بوو کە ڤۆرۆنتسۆڤ فەرماندەی بوو. لە ئاکامدا ئەگەر هێزی یارمەتیدەر نەهاتایە بە هانایانەوە هەموویان تێدا دەچوون و لەو شەڕەدا کەسیان دەرباز نەدەبوون. هەموو دەیانزانی ئەو شەڕەی دارگۆ فەرماندەییەکەی لە ئەستۆی ڤۆرۆنتسۆڤ بووە و وەک ئاوێنەیەک دیمەنی بەزین و شکستی سەرشۆڕانەی ڕووسەکانی پیشان دەدا. لەو شەڕەدا جگە لەوەی زۆربەی سەربازە ڕووسییەکان کوژران و بریندار بوون، چەند دەزگا تۆپهاوێژیش دەستی بە سەردا گیرا و چەکوچۆڵێکی زۆر کەوتە دەست هێزەکانی شامیل، بۆیە باس کردنی ئەو ڕووداوە لە هەنتەشی ڤۆرۆنتسۆڤدا دەیشڵەژاند و برینی دەکولاندەوە؛ مەگین

---

41- Gergebel
42- Zolotakhin
43- Dargo

گێڕانەوەی ڕووداوەکە بە پێی ئەو ڕاپۆرتە بوایە کە بۆ تێزاریان نارد بوو.

ئەو شکستە پڕ شوورەییەی ڕاپۆرتەکەی وەک داستانێکی پڕ شانازی و سەرکەوتووانە بۆ تێزار بەڕێ کرا بوو و لەودا باسی ئازاریەتی و قارەمانێتیی هێزەکانی ئەرتەشی ڕووس کرابوو. بەڵام بەکارهێنانی وشەی مەفرەزەی ڕزگاری ئەوەی وەبیر دەهێنایەوە کە تێکهەڵچوونەکە نەک سەرکەوتووانە نەبووە بەڵکوو زۆریش سەرشۆڕانە و پڕشوورەیی بووە. هەموو ئامادە بووان لە چۆنییەتیی ئەو شەڕە ئاگادار بوون. چەند کەسیان وایان دەنواند کە لە مانای وتەکانی ژینڕاڵ تێناگەن؛ هێندێکیشیان خەمی ئەوەیان بوو کە بڵێی چی ڕوو بدات؛ چەند کەسیش چاویان لە یەکتر دەکرد و تەوسەبزەیان لە سەر لێو بوو. تەنیا ژینڕاڵی سمێڵ بابڕ نەیدەزانی چی دەکات و چی دەبێژێ. کەوتبووە چەنەوێرغە و نەیدەبڕییەوە. لە سەر ئەوە سوور بوو کە هەموو وردەکارییەکانی ئەو شەڕ وتێکهەڵچوونە بۆ ئامادە بووان بگێڕێتەوە و باسی مەفرەزەی ڕزگاریی دەکرد.

ژینڕاڵ دەیگوت حاجی مراد توانیبووی بە زیرەکی و لێزانی لیواکەی ژێر فەرماندەیی ڤۆرۆنتسۆڤ بکات بە دوو کەرتەوە: «ئەگەر هێزی یارمەتیدەر لە کاتی خۆیدا نەگەیشتایەنەتە شوێنی تێکهەڵچوونەکە (دەتگوت چێژ لە وشەی ڕزگاری و یارمەتیدەر وەردەگرێ) تەنانەت یەک سەربازی ڕووسی لەو شەڕە دەرباز نەدەبوو. چونکە...» بەڵام قسەکەی تەواو نەکرد، چونکە شازادە خانم ئارێبلیانی کە بۆی دەرکەوتبوو چۆن کۆڕەکە باری نائاسایی لە خۆ گرتووە و لەوانەیە ڕووداوێکی لێ بکەوێتەوە، قسەکەی پێبڕی و بەبێ پێشەکی لێی پرسی لە شوێنی مانەوەی خۆی لە تفلیس ڕازییە یان نا؟

ژینـراڵ کە تووشـی سەرسـوورمان بووبـوو، چـاوی لە دەوروبەری خـــۆی کـــرد. چـــاوی بە یـــاوەرەکەی کەوت کە لەو بەری مێـــزەکە دانیشـتبوو، لە خـاڵێکی نادیـاری دەڕوانـی و جارجـار چـاوێکی مانـاداری لێـدەکرد. ژینـــراڵ تێگەیشـــت کە تووشـــی هەڵە بـــووە و بە وتەکـــانی سنووری بەزاندووە. بێ ئەوەی وەڵامی شازادە خانم ئارێبلیانی بداتەوە بێدەنگ بوو و دەستی کرد بە خواردنی ئەو خۆراکەی لە دەورییەکەی بەر دەستیدا بوو، بێ ئەوەی تێبگا چ تامێکی هەیە.

هەمـووان شـڵەژا بـوون، بەڵام ئەمیـری گـورجی کە لە پـاڵ شـازادە خانم ڤۆرۆنتسۆڤدا دانیشتبوو و پیاوێکی گەمژە بـوو، بەڵام لە فێڵبـازی و جامەلووسـکێدا هـیچ کەس دەسـکی لە دوو نەدەکـرد، بە بـێ پێشـەکی دەستی کـرد بە بـاس کردنـی ڕووداوی ڕفانـدنی ژنەکەی ئەحمەد خـانی مەختوولی لە لایەن حاجی مرادەوە:

«شـــەوێ هێرشـــی کـــردە ســـەر گونـــدەکە و ئەوەی مەبەسـتی بـوو پێچایەوە و لەگەڵ سوارەکانی تێیان تەقاند.»

شازادە خانم لێی پرسـی: «بۆ چـی ئەو ژنەی ڕفانـد؟ چ مەبەسـتێکی هەبوو.»

«لەگەڵ مێـردەکەی دوژمنایەتییــان بــوو، بەڵام هــیچ کــات لەگەڵــی بەرەوڕوو نەبوو. کاتێـک ئەحمەد خـان مـرد بەڕفانـدنی ژنەکەی ویسـتی تۆڵەی لێبکاتەوە.»

شـــازادە خـــانم ئەو وتـــانەی بـــۆ کـــۆنتس شـــۆئازۆلی هـــاوڕێی وەرگێڕایەوە کە لە پەنا ئەمیری گورجی دانیشـتبوو. کۆنتس گـوتی: «بە ڕاستی کارێکی بێبەزییانەیە!»

ڤۆرۆنتسۆڤ بە بزەیەکەوە گوتی: «نا؛ من ئاگادارم لەگەڵ دیلەکەی زۆر بە ڕێــز و شـــەڕافەتمەندانە جـــووڵاوەتەوە و پاشـــان ئـــازادی کردووە.»

«کەوایە بۆ ئازاد کردنی باجی وەرگرتووە!»

«بەڵێ وایە، بەڵام سـەرەڕای ئەوەش بە شـێوەیەکی شـەرافەتمەندانە ڕەفتاری لەگەڵ ئەو ژنە کردووە.»

ئەم وتـانەی ڤۆرۆنتسـۆڤ بـواری درێـژە پێـدانی قسـەکانی ڕوون کـردەوە. هەمـووان تێگەیشـتن کە هەر چـی زیـاتر باسـی ئـازایەتی و جـوامێریی حـاجی مـراد بـکەن و پەسـنی کـار و چالاکییەکـانی بـدەن. ڤۆرۆنتسۆڤ زیاتر پێی دەگەشێتەوە و کەیفی ساز دەبێ.

«ئـــازایەتی و جـــوامێریی حـــاجی مـــراد بـــۆ تەواوی خەڵـــک دەرکەوتووە.»

«سـاڵی 1849 بە ڕۆژی ڕوونـاک هێرشـی کـردە سـەر ئەنجـومەنی تیمیرخان[٤٤] و لە بەر چاوی هەمووان دووکانەکانی تاڵان کرد.»

پیـاوێکی ئەرمەنـی کە لەو سـەری مێـزەکە دانیشـتبوو لەو کـاتەدا لە ئەنجومەنی تیمیرخـان بووبـوو و بە چـاوی خـۆی ڕووداوەکەی دیتبوو، دەستی کرد بە گێڕانەوەی چۆنیەتیی هێرشەکەی حاجی مراد.

باسی ئازایەتییەکانی حاجی مراد بووبوو بە نوقڵی کۆڕەکە.

هەر کەس بە نـۆرەی خـۆی باسـی جـوامێری و ئـازایەتی و لێزانیـی حـاجی مـرادی دەکـرد. یەکیـان گـوتی جارێـک حـاجی مـراد فەرمـانی قەلاچـۆکردنی بیسـت و شـەش هەزار کەسـی دابـوو؛ هەر لەو کاتەشـدا

---

44- Temir khan

لەگەڵ ئەو وەڵامە بەرەورِوو بوو: «ناچاربوو، جگە لەوە چیی پێدەکرا؟ شەڕ شەڕە!»

«پیاوێکی مەزنە!»

«ئەگەر لە ئەورووپا لە دایک بووایە، ڕەنگە بووبووایەتە ناپلیۆنێکی تر.»

ئەمە قسەی ئەو گورجییە ماستاوچی و خاپینۆکە بوو کە دەیزانی هەر چەشنە ناو هێنانێکی ناپلیۆن ڤۆرۆنتسۆڤی پێ دەگەشێتەوە.

ڤۆرۆنتسۆڤ گوتی: «ناپلیۆن نا، بەڵام دڵنیا بە فەرماندیەکی کارامەی سوارە نیزام دەبوو.»

«ئەگەر نەبوایەتە ناپلیۆن، خۆ دەبووە موورات[45]!

«ناویشی حاجی مرادە.»

یەکێکی دیکە لە میوانەکان گوتی: «ئێستا کە حاجی مراد خۆی بە دەستە داوە، ئیتر شامیل پشتی دەشکێ.»

یەکێکی تریش گوتی: «ئێستا تێدەگەن (مەبەستی لە ئێستا ئامادەبوونی ڤۆرۆنتسۆڤ بوو) کە دنیا لە دەستی کێدایە!»

مانانا ئارێبلیانی ڕووی دەمی لە ڤۆرۆنتسۆڤ بوو گوتی: «ئەمانە هەمووی لە سایەی سەری جەنابتانەوەیە.»

شازادە ڤۆرۆنتسۆڤ هەوڵی دا ئەو جامەلووسکێ و ماستاوکردنانە دەرهەق بە خۆی کەم بکاتەوە، بەڵام پێشی ناخۆش نەبوو، هەر بۆیە بە ورەیەکی بەرز و دڵێکی خۆشەوە میوانەکانی بۆ ژووری میوانداری ڕێنوێنی کرد. دوای شێو خواردن و کاتی خواردنەوەی قاوە، شازادە

45- Murat

ڤۆرۆنتسۆڤ لەگەڵ یەک بە یەکی میوانەکان قسەی کرد و بە ڕووی ژێنراڵی سمێڵ بابڕیدا نەدایەوە کە قسەیەکی نابەجێی کردووە.

دوای ڕێزدانان بۆ میوانەکان لە سەر مێزی پاپەزێن دانیشت و پەڕی بڵاو کردەوە. شەریکەکانی ڤۆرۆنتسۆڤ، ئەمیری گورجی و ژێنراڵە ئەرمەنییەکە بوون و هەروەها دوکتۆر ئاندریڤسکی کە بە هۆی دەستڕۆیشتوویی ڕێزی بۆ دادەنرا. شازادە ڤۆرۆنتسۆڤ نشووکدانی (انفیەدان) ئاڵتوونیی خۆی دەرهێنا کە وێنەی تێزاری لە سەر ڕەسم کرابوو، لە بەر دەستدا دانیا. بەستەیەک پەڕی لە نێو پەڕدانە زێڕینەکەی دەرهێنا. دەیویست پەڕەکە دانێ کە پێشخزمەتی ئیتالیایی نامەیەکی لە سەر کەشەفی زێوین هێنا و دایە دەستی.

شازادە دوای ئەوەی داوای لێبووردنی لە هاوبارییەکانی کرد. نامەکەی هەڵپچڕی و دەستی کرد بە خوێندنەوەی. نامەکە لە لایەن کوڕەکەیەوە بوو، چۆنیەتیی خۆ بە دەستەوەدانی حاجی مراد و کێشەکەی لەگەڵ ژێنراڵ میلێر زاکۆملسکیی بۆ باوکی نووسیبوو. ژنەکەی هاتە پێشێ و سەبارەت بە ناوەرۆکی نامەی کوڕەکەی پرسیاری لێکرد. شازادە بە زمانی فەڕەنسی، ئاماژەیەکی کورتی بە ڕووداوە کرد و پاشان لەگەڵ ئەوەی نامەکەی دەدایە دەست هاوسەرەکەی، بە زمانی ئینگلیزی گوتی: «... بەڵام هیوادارم ئاکامێکی باشی لێ بکەوێتەوە» پاشان بە هاوبارییەکانی گوت: «تکایە پەڕ هەڵگرن.»

کە دەستی یەکەمی پەڕەکان دابەش کران. کارێکی کرد کە هەمیشە لە کاتی سەر خۆشیدا دەیکرد: بە دەستە سپی و چرچولۆچەکانی تۆزێکی نشووکی فەڕەنسی هەڵگرت، لە بەر لووتیدا ڕایگرت و هەڵیمژی.

## ده

ڕۆژی دوایـی، کـاتی هـاتنی حـاجی مـراد، ژووری چـاوەڕوانیی کۆشکی شازادە ڤۆرۆنتسۆڤ زۆر قەرەباڵغ بوو: ژینڕاڵی سمێڵ بابڕی دوێنـێ بە جلـوبەرگی فەرمـی و هەمـوو میـدالیا و نیشـانەکانییەوە، هـاتبوو بـۆ ماڵئـاوایی؛ فەرمانـدەی تابوورێـک بە هـۆی گەنـدەڵی و پاشـقلدانی پـارە لە سـندووقی دابینکـاری، مەترسـیی ئەوەی هەبـوو محـاکەمەی نیزامـی بکـرێ؛ ئەرمەنییەکـی سـاماندار (کە دوکتـۆر ئاندرێڤسـکی پشـتیوانیی لێـدەکرد) دەیویسـت دەوڵەت سەرپشـکی سـنووورداری ڤۆدکـای بـۆ تـازە بکـاتەوە؛ بێـوەژنێکی ڕەشـپۆش کە مێـردەکەی ئەفسـەر بـوو و لە تێکهەڵچـوونێکی سـەربازیدا گیـانی لە دەسـت دابـوو، هـاتبوو مـووچەی مانگـانەی مێـردەکەی وەرگـرێ و هەروەهـا دەخـوازیی ئەوەی هەبـوو فەرمـانگەی فێرکـردن و بارهێـنان چاوپۆشـی لە مانگـانەی قوتابخـانەی منـداڵەکانی بکـات؛ شـازادەی مـایەپووچی گورجی کە جلوبەرگی گورجیایی سەرنجڕاکێشـی لە بەر دابوو، دەیویست بەشێک لە مڵکی دەست بەسەرداگیراوی کلیسا بە ناوی خۆیەوە تاپۆ بکات؛ ئەفسەرێک کە باوەشێک کاغەز و خەریتەی هێنا بـوو تـاکوو پێشـنیاری خـۆی بـۆ دەسـت بەسـەرداگرتنی هەمـوو خـاکی قەفقـاز ئاراسـتە بکـات؛ خـانێکیش تەنیـا بەو هـۆیە هـاتبوو کە کاتێک دەگەڕێتەوە بۆ گوندەکەی خۆی بڵێ چووە بۆ دیداری شازادە ڤۆرۆنتسۆڤ.

هەموو چاوەڕوانی نۆرەی خۆیان بوون تاکوو یاوەری گەنج و سەروڕووخۆشی شازادە بیاننێرێتە ژووری.
کاتێک حاجی مراد بە هەنگاوی خێرا هاتە ژووری، کە تۆزێک دەشەلی، تەواوی چاوەکان بۆ لای ئەو سووڕان و ناوەکەی بە سرتە دەم بە دەم بە نێو ژوورەکەدا گەڕا.
چەرکەسییەکی سپی و درێژی لە بەر دابوو. بە سەر ئەویشدا کوڵەباڵێکی قاوەیی لەبەرکردبوو. دەوری کۆبەی کوڵەباڵەکەی زێودۆزی کرابوو. بەلەکپێچ و چەکمەی ڕەشی لە پێدا و بە قاچییەوە نووسابوو. مێزەری لە سەر بەستبوو. هەر ئەو مێزەرە بوو کە بە هۆی شەیتانی کردنی ئەحمەد خانەوە، ژینڕاڵ کلووگنائۆ[46] قۆڵبەستی کرد و هەر ئەوەش بووە هۆی ئەوەی بچێتە ڕیزی هێزەکانی شامیلەوە.
بە سەر تەرکی چێوینی ژووری چاوەڕوانیدا تێپەری. قەڵافەتی باریکی بە هۆی شەلین و کورتتر بوونی لاقێکی، بە ئاستەم سووڕی دەخوارد. بە چاوانی کە هێندێک لە یەک دوور بوون، بە شێوەیەکی هێمنانە لە بەر پێی خۆی دەڕوانی و دەتگوت هیچ کەس نابینێ.
یاوەری جوانچاک و ڕەزا شیرین بە ڕێزەوە پێشوازیی لێکرد و داوای لێکرد لە سەر کورسییەک دانیشێ تا هاتنی بە شازادە ڕادەگەیێنێ؛ بەڵام حاجی مراد دانەنیشت. دەستی لە سەر خەنجەرەکەی دانا. قاچێکی بردە پێشێ و بەبی موبالاتییەوە چاوی لە ئامادە بووان کرد.
شازادە تارخانۆڤ[47] دیلمانجی شازادە ڤۆرۆنتسۆڤ، هات بۆ لای حاجی مراد و قسەی لەگەڵ کرد. حاجی مراد بە کورتی و قورس و

---

46- Klugenau
47- Tarkhanov

قایم وەڵامی دایەوە. ئاغازادەیەکی ناوچەیی کە هاتبوو سکاڵای خۆی بە دژی ئەفسەرێک بەرز بکاتەوە لە ژووری شازادە ڤۆرۆنتسۆڤ هاتەدەرێ. یاوەر ناوی حاجی مرادی خوێندەوە و ڕێنوێنیی کرد بۆ ژووری فەرماندە.

فەرماندەی گشتی لە پاڵ مێزەکەیدا ڕاوەستا بوو کە حاجی مراد چووە ژوورێ. ئیتر ئەو بزە پڕ نەشەیەی دوێنێ لە سەر لێوی نەبوو و زیاتر جیددی و نائارامی دەنواند.

حاجی مراد لەگەڵ چوونە نێو ژوورە بەرین و بەشکۆکەوە کە مێزێکی گەورە و پەردەی هەورێشمینی پەنجەرەکانی سەرنجڕاکێش بوون، هەر دوو دەستی لە سەر سینگی دانا و چاوی لە بەر پێی خۆی بڕی. بە شێنەیی و بە وشەی داناردانار بە زمانی کوومیک[٤٨] کە زۆر بە باشی لێی شارەزا بوو، گوتی: «خۆم تەسلیمی تێزاری بەهێز و ئێوە دەکەم. سوێندیش دەخۆم بە دڵ و گیانەوە خزمەت بە تێزار بکەم و ئەگەر پێویست بێ هەتا دوایین دلۆپی خوێنم لە ڕێگای ئەودا تێدەکۆشم و سەرم لە پێناوی ئەودا دەبەخشم. هیوادارم لە شەڕدا بە دژی شامیل کە دوژمنی منیشە، بتوانم جەنگاوەرێکی بەکەڵک و لێوەشاوە بم.

ڤۆرۆنتسۆڤ دوای ئەوەی بە وردی گوێی لە وتەکانی دیلمانج گرت، چاوێکی لە حاجی مراد کرد. حاجی مرادیش چاوی لە چاوی ئەو بڕی. نیگای چاوی هەر دووکیان بۆ چەند چرکەیەک لێک گرێدرا. نیگایەک کە زۆر لە وتەکانی دیلمانج پڕ ماناتر بوو: قسەی وای تێدا بوو کە هیچکامیان بە زمان دەریاننەبڕیبوو. چاوانی ڤۆرۆنتسۆڤ

48- Kumyk

دەیگوت باوەر بە یەک وشە لە قسەکانی حاجی مراد ناکا. دەشیزانی حاجی مراد هەتا ئەو کاتەی زیندوو بێ نەیاری تێزار و هەموو ڕووسیا و ڕووسەکانە. ئێستاش کە خۆی بە دەستەوە داوە لە بەر ناچارییە. حاجی مرادیش دەیزانی شازادە ڤۆرۆنتسۆڤ لە ویستی دەروونیی ئەو تێدەگا. سەرڕای ئەوەش بەڵێنی پێدەدا و سوێندی بۆ دەخوارد کە وەفادار دەمێنێتەوە. نیگاشی دەیگوت: «ئەم پیرەپیاوە ڕووسییە کە لاقێکی لە گوێ قەبرە، هێشتا بیر لە شەڕ و کوشتن دەکاتەوە؛ بەڵام زۆر پیاوێکی زیرەک و لە بنەوەبڕە. دەبێ زۆر وریابم.» ڤۆرۆنتسۆڤ هەموو ئەوانەی دەزانی، بەڵام وای قسە دەکرد کە پێی وابوو بەرژەوەندییەکی باشە بۆ خەبات و سەر کەوتن لە شەڕدا.

ڤۆرۆنتسۆڤ بە دیلمانجەکەی گوت: «پێی بڵێ: ئیمپراتۆری ئێمە زۆر بە هێزە، بەڵام بەو ڕادەیەش بەخشندەیە؛ منیش داوای لێدەکەم گەورەیی بنوێنێ و لێی خۆشبێ بۆ ئەوەی خزمەت بە ئیمپراتۆر بکات...» پاشان گوتیشی: «هەتا ئەو کاتە، ئەو میوانی من دەبێ و هەوڵ دەدەم بە جوانی میوانداریی لێ بکەم.»

حاجی مراد دیسان هەر دوو دەستی لە سەر سینگی دانا و بە تین و گوڕەوە گوتی ساڵی 1839 کە فەرمانڕەوای ئاڤاریا بووە بە ڕاستی و دڵپاکییەوە خزمەتی بە ڕووسەکان کردووە و ئەگەر ڕووسەکان ئەویان نەدایەتە دەست دوژمنەکانی و ژینراڵ کلوگنائۆ لە سەر داوای ئەحمەد خان ئەوی قۆڵبەست نەکردایە، ئەوان ئاوا نێوانەکەیان ئاڵۆز نەدەبوو.

ڤۆرۆنتسۆڤ گوتی: «دەزانم،دەزانم.»

خـۆی دانیشــت و داوای لە حــاجی مــرادیش کـرد دانیشــێ. بەڵام حــاجی مــراد دانەنیشــت؛ شــانی هەڵتەکانــد و گــوتی: «ئەوەنــدە ڕووهەڵماڵـدراو نییە لە هەنتەشـی پیـاوێکی پـایەبەرزی وەک شـازادە ڤۆرۆنتسۆڤدا دانیشـێ.» پاشـان ڕووی لە دیلمـانجەکە کـرد و درێـژەی بە قسەکانی دا:

«ئەحـمەد خـان و شـامیل هەر دووکیـان دوژمنـی منن. بە شـازادە بڵێ ئەحمەد خان مردووە و ناتوانم تۆڵەی لێ بکەمەوە، بەڵام شـامیل زیندووە و من هەتا تۆڵەی لێ نەستێنم، ئەم دنیایە جێ نـاهێڵم.» نێو چاوانی گرژ کرد و بێدەنگ بوو.

ڤۆرۆنتسۆڤ بە ئارامی لە دیلمانجەکەی پرسـی «دەی باشـە، چۆن دەیهەوێ تۆڵە لە شامیل بستێنێ؟...« پێی بڵێ دەتوانێ دانیشێ.»

حاجی مراد دیسان دانەنیشت و گوتی ئامـانجی سـەرەکیی مـن بۆ هاتنە پاڵ ڕووسەکان، لە نێوبردنی شامیلە.

ڤۆرۆنتسۆڤ گوتی: «بەڵـێ، بەڵـێ، بەڵام دەمـهەوێ بزانم دەیـهەوێ چبکات و چ پیلانێکی بۆ ئەو کارە هەیە؟»

حاجی مراد دانیشت. گوتی ئەگەر بینێرن بۆ بەرەی شـەڕ لە لێزگی و هێـزی چەکـداری لە ئیختیـار دابـێ، بەڵـێن دەدا هەمـوو داغسـتان ڕاپەڕێنێ و شامیل لە نێو ببات.

ڤۆرۆنتســۆڤ گــوتی: «فیکرێکــی خــراپ نیــیە. دەبــێ بیــری لــێ بکەمەوە.»

دیلمانج وتەکانی ڤۆرۆنتسـۆڤی بۆ حـاجی مـراد وەرگێڕاوە. حـاجی مراد چوو لە ماڵی فێکرەوە. پاشان ڕووی لە دیلمانجەکە کرد و گوتی: «بە شازادە بڵێ کێشـەیەکی تر لە گۆڕێدایە. ئێستا بنەماڵەکەم لە چنگی دوژمــن دایە؛ هەتــا ئەو کــاتەی بنەمــاڵەکەم لە کوێســتانن، دەســتم

بەستراوە و ناتوانم کارێک بکەم. ئەگەر بە ئاشکرا بە دژی شامیل هەستم، ژنەکەم و دایکم و منداڵەکانم دەکووژن. شازادە سەرەتا دەبێ ئەوان لەگەڵ دیلەکانی هێزی شامیل بگۆڕێتەوە؛ ئەو کاتە بەڵێن دەدەم یان شامیل لە نێو دەبەم یان لەو ڕێگایەدا سەرم دادەنێم.»

شازادە گوتی: «زۆر باشە لەو بارەشەوە بیر دەکەینەوە. بابچێ بۆ لای سەرۆکی سەر کردایەتی و بارودۆخی خۆی و کاروبار و ویستەکانی ئێمەی بە وردی بۆ باس بکات.»

بەم شێوەیە یەکەم دانیشتنی حاجی مراد لەگەڵ شازادە ڤۆرۆنتسۆڤ کۆتایی پێ هات.

ئەو شەوە لە تەماشاخانەی نوێی شار کە بە شێوازی ڕۆژهەڵاتی ڕازاندبوویانەوە، ئوپێرایەکی ئیتالیایی نمایش دەدرا. ئەو کاتەی کە قەڵافەتی سەنجراکێشی حاجی مراد بە مێزەرەوە، لە سەر بانجێڵەی تەماشاخانەکە دەرکەوت، شازادە ڤۆرۆنتسۆڤ لە لۆژەکەی خۆی دانیشتبوو؛ لەگەڵ لۆریس ملیکۆ[49] کە هەم یاوەری شازادە بوو و هەم بەرپرسیایەتیی میوانداری کردن لە حاجی مرادی لە ئەستۆ بوو. حاجی مراد پەردەی یەکەمی شانۆکەی بە قورساخییەکی تایبەتی ڕۆژ هەڵاتییە موسوڵمانەکانەوە چاو لێدەکرد. پاشان هەستا چاوی لە دەوروبەری خۆی کرد و لە تەماشاخانەکە چووە دەرێ.

ڕۆژی دوایی دووشەممە بوو. بەپێی دابی ئاسایی خۆیان لە کۆشکەکەی ڤۆرۆنتسۆڤدا کۆڕی سەما بەڕێوە دەچوو. لە تالاری گەورە و ڕووناکی کۆشکدا، گرووپێکی مۆزیک کە لە نێوان لق و پۆپی دارەکاندا دیار نەبوون، هەوایەکیان دەژنی. ژنەکەی شازادە

49- Loris Melikov

ڤۆرۆنتسۆڤ ئەگەر چی تەمەنێکی ڕابواردبوو، بە نیوەڕووتی لە نێوان میوانەکاندا دەگەڕا و بە پێکەنینەوە بەخێراهاتنی دەکردن؛ چەند وشەیەکیش لەگەڵ حاجی مراد دوا. حاجی مراد هەر ئەو ساردوسڕی و ناهۆگرییەی دوێنێی تەماشاخانەی لە خۆی نیشان دا و چاوی لە دەوروبەری خۆی کرد. دوای خاتوونی خانەخۆی، ژنانی نیوەڕووتی دیکە، بەبێ ئەوەی شەرم بیانگرێ، دەهاتن بۆ لای حاجی مراد و هەموویان پرسیارێکیان لێدەکرد و بیرو ڕای ئەویان سەبارەت بە کۆڕ و میوانداررییەکە لێ دەپرسی. تەنانەت ڤۆرۆنتسۆڤ خۆشی بە سەرشانی ئاڵتوونی و پۆلێک نیشان و میدالیای سەرسینگییەوە، هات بۆ لای حاجی مراد و ئەو پرسیارەی لێکرد. ئەویش وەک ئەوانی تر پێی وابوو حاجی مراد زۆری کۆڕەکە بە دڵە و چێژی لێوەردەگرێ. وەڵامی حاجی مرادیش هەر ئەو وەڵامە بوو کە بە ئەوانی دیکەی دابۆوە: لە نێو گەلی ئێمەدا ئەم جۆرە داب‌ونەریتانە نییە. بیر و ڕای خۆشی دەرنەدەبڕی کە ئەوەی دەیبینێ بە شتێکی باشی دەزانێ یان نا.

لە جەنگەی سەما کردنەکەدا، حاجی مراد ویستی سەبارەت بە بنەماڵەکەی لەگەڵ شازادە ڤۆرۆنتسۆڤ قسە بکات، بەڵام ئەو وای نواند کە گوێی لێ نەبووە. دواتر لۆریس ملیکۆڤ حاجی مرادی حاڵی کرد کە لەو جۆرە کۆڕانەدا باو نییە کە باسی کارێک بکرێ. حاجی مراد کە چاوی لەو کاتژمێرە کرد وا ڤۆرۆنتسۆڤی لاو بە دیاری پێیدا بوو، بۆی دەرکەوت سەعات یازەدە لایداوە، لە لۆریس ملیکۆڤی پرسی دەتوانێ بڕوا؟ لۆریس میکۆڤ گوتی دەتوانێ، بەڵام واباشترە نەڕوات. بەڵام حاجی مراد گوێی بە قسەی ئەو نەدا. سواری گالیسکەیەک بوو کە نابوویانە ئیختیارییەوە و ڕۆیشت بەرەو خەوگە و شوێنی حەسانەوەکەی.

## یازده

ڕۆژی پێنجەمی مانەوەی حاجی مراد لە تفلیس، لۆریس ملیکۆڤ، یاوەری شازادە ڤۆرۆنتسۆڤ، فەرمانیدا حاجی مراد بچێت بۆ لای. حاجی مراد هەر بەو لەبزە سیاسەتوانانە و زاتییەی خۆیەوە گوتی: «سەر و گیانم لە پێناوی شازادەی بەڕێزدایە.» هێدی و لە سەرەخۆ بە نیشانەی ڕێز گرتن سەری داخست: «دەستوور بفەرموو قوربان!» پاشان بە چاوێکی دۆستانە لە ڕوخساری لۆریس ملیکۆڤ ڕاما.

لۆریس ملیکۆڤ لە سەر قەنەفەی پاڵ مێزەکە دانیشت، حاجی مرادیش لە سەر کورسییەکی ڕووبەڕووی ئەو دانیشت، دەستی لە سەر چۆکی دانا و بەوردی گوێی بۆ وتەکانی لۆریس ملیکۆڤ شل کرد. لۆریس ملیکۆڤ کە بە سەر زمانی تاتاریدا زاڵ بوو، گوتی ئەگەرچی شازادە لە وردەکارییەکانی ژیانی ڕابردووی حاجی مراد ئاگادارە بەڵام دەیهەوێ سەربردەی ئەو سەر لە بەری و مووبەموو لە زمانی خۆی ببیستێ: «بۆم بگێڕەوە و منیش هەمووی بە ڕووسی بۆ وەردەگێڕمەوە و شازادەش دەینووسێتەوە و ئاڕاستەی خاوەن شکۆ تێزاری دەکات.»

حاجی مراد ماوەیەک بێدەنگ بوو (هیچ کات قسەی بە کەسێک نەدەبڕی؛ ڕادەوەستا هەتا ڕووبەڕووەکەی قسەکانی تەواو دەبوو)

پاشان سەری هەڵبڕی، کڵاوەکەی لە سەر نێوچاوانی هەڵکێشا. ئەو بزە منداڵەنەیەی کە دڵی خاتوو ماریا ڤاسیلیۆڤنای ڕفاندبوو، دیسان نیشتە سەر لێوی و گوتی: «گرینگ نییە، بە سەر چاو.» وێدەچوو هەست بە شانازی بکات کە تێزار سەربردەکەی دەخوێنێتەوە.

لۆریس ملیکۆڤ دەفتەرێکی لە گیرفانی دەرهێنا و گوتی: «تۆ دەبێ هەموو شتێک بەبێ زیادوکەم بە من بڵێی.»(لە زمانی تاتاریدا بە هەموو کەس دەڵێن تۆ و بە هیچ کەس ناڵێن ئێوە.)

«کێشە نییە. بەڵام بەسەرهاتەکان هێندە زۆرن دوایی نایە. هێندەم ڕووداو و کارەسات دیوە بەم دەمودەستە ناگوترێ.»

«ئەگەر بە ڕۆژێک نەتتوانی بیگێڕییەوە، پاشماوەکەی دەخەینە ڕۆژێکی تر.»

«لە سەرەتاوە دەست پێبکەین؟»

«بەڵێ، لە نووکەوە. لە کوێ لە دایک بووی و لە کوێ ژیاوی؟»

حاجی مراد سەری داخست. ماوەیەک بەو حاڵەمایەوە. پاشان چیلکەیەکی هەڵگرت کە لە پاڵ کورسییەکەدا کەوتبوو؛ چەقۆیەکی تیژ کە دەسکەکەی بە عاج و ئاڵتوون ڕازا بۆوە، دەریهێنا و دەستی کرد بە تاشنی چیلکەکە و گوتی:

«بنووسە لە گوندێکی چکۆڵە بە ناوی تسێلمێس[50] لە دایک بووم کە بە وتەی ئێمەی لادێیی چیانشین بە قەد سەری گوێدرێژێک دەبوو. لە نزیک ئەو گوندە و بە مەودای هاویشتنی بەردێک، خوونزاخ[51] هەڵکەوتووە، شوێنی ژیانی خانەکانە. بنەماڵەی ئێمە لە خانەکان نزیک بوو و هاموشۆی گەرموگوڕیان هەبوو.

---

50- Tselmess

51- Khunzakh (ئاڤاریا) پێتەختی داغستان

کاتێک براگەورەکەم عوسمان لە دایک بوو، دایکم دایەنی ئەبوو نووتسال خان[52] کورە گەورەی خان بوو. پاشان بوو بە دایەنی ئوومماخان[53] کوڕی دووهەمی خان و ئەوی گەورە کرد؛ بەڵام ئەحمەد ـ دووهەمین برام ـ مرد. وابوو کاتێک خان خانم، هاوکات لەگەڵ لە دایک بوونی من کوڕە چکۆڵەکەی واتە بوولاچ [54] خانی بوو، دایکم ڕازی نەبوو ببێتە دایەنی منداڵەکەی و ئیتر نەچوو بۆ ماڵی خان. باوکم ڕقی هەستا و فەرمانی پێدا بچێ، بەڵام دایکم بە قسەی نەکرد، گوتی: «ئەگەر بچم ئەم منداڵەشم دەمرێ؛ کەوایە ناچم.» باوکم بە تووڕەیی خەنجەری لێ هەڵکێشا و زەبرێکی لە سینگی دا و هەڕەشەی لێکرد ئەگەر نەچێ دەیکوژێ. لەگەڵ ئەوەشدا دایکم لە سەر قسەی خۆی سوور بوو و منی بە جێ نەهێشت. پاشان گۆرانییەکی ساز کرد کە ئەوەی بە سەرم هاتبوو لەودا باس کرابوو... بەڵام ئێستا پێویست بە گوتنی ناکات...»

«نا،تۆ دەبێ هەموو شتێک باس بکەی، مووبە موو.»

حاجی مراد خەیاڵ هەڵیگرت. وەبیری هاتەوە کە دایکی ئەوی دەبردە سەربانی خۆیان و لە پاڵ خۆیدا دەیخەواند و کەڵپۆسێکی پێدا دەدا؛ ئەویش داوای لە دایکی دەکرد ئەو برینەی جێ دەمی خەنجەرەکەی پیشان بدات کە باوکی لە سینگی دابوو، ئەویش پیشانی دەدا. حاجی مراد گۆرانییەکەی دایکی گوت: «خەنجەری تیژت سینگی هەڵدڕیم

بەڵام من ڕۆڵەم،جگەر گۆشەکەم گرتە باوەشم

---

52- Abu nutsal

53- Umma

54- Bulach

گوشیم بە سینگی نەرمی خۆمەوە
ئەوم بە خوێنی سینگی خۆم خووساند:
زامم سارێژ بوو، بێ هیچ مەرهەمێ
ئیتر کوڕەکەم وەکوو خۆم باکی لە مردن نابێ...
ئێستا دایکم دیلی دەستی شامیلە... دەبێ هەرچۆنێکە ڕزگاری بکەم...»

حاجی مراد کانیاوی داوێنی گردەکەی وەبیر هاتەوە، ئەو کاتەی وەبیر هاتەوە کە لەگەڵ دایکی دەچوو بۆ ئەو کانیاوە ئاو بێنن و ئەو دەستی بە داوێنی کراسە فشەکەی دایکی دەگرت و بە دوایدا هەڵدەهات. وەبیری هاتەوە چۆن بە دیتنی کەللە سەری خڕ و چکۆڵە و تاشراوی خۆی لە نێو تەشتۆکە مسەکەدا کە بە دیواردا هەڵواسرا بوو، سەری سووڕما؛ ئەو کاتەی دایکی بۆ یەکەم جار سەری بۆ تاشیبوو. ئەو سەگە کز و ڕیوەڵەیەی وەبیر هاتەوە کە فێر بووبوو دەهات و دەموچاوی دەلستەوە؛ بۆنی خۆشی نانی گەرم کە دایکی پێیدەدا «بۆنێکی ئاوێتەی دووکەڵ و بۆنی شیری ترشاو. وەبیری هاتەوە کە دایکی چۆن دەیخستە نێو سەوەتەیەکەوە و دەیدا بە کۆڵیدا بە دۆڵ و هەورازی کوێستاندا سەردەکەوتن و دەچوون بۆ لای باوەگەورەی لە زۆزان. باوەگەورەی زێوگەر بوو، حاجی مراد ئێستاش دەموچاوی چرچولۆچ و سەر و ڕیشی سپیی ئەوی لەبەر چاو بوو ـ کاتێک بە دەستە بە هێزەکانی لە سەر زێوە کەندەکاریی دەکرد.

حاجی مراد لەگەڵ ئەوەی سەری ڕادەوەشاند، گوتی: «بەڵێ، دایکم بە هیچ شێوەیەک پیمل نەبوو ببێتە دایەنی بوولاچ خان و خان خانم دایەنێکی دیکەی گرت، بەڵام هەروا هۆگری دایکم بوو. دایکم زۆر جار

ئێمەی دەبرد بۆ دیوەخانی خان خانم و ئێمە لەگەڵ منداڵەکانی خان یاریمان دەکرد. خان خانم زۆر مێهرەبان بوو لەگەڵمان. ئەو سێ منداڵی بوو: ئەبوو نووتسال خان کە برای شیریی عوسمانی برام بوو، ئومماخان کە برای شیریی من بوو، بوولاچ خان کە لە هەمووان کەم تەمەنتر بوو ـ هەر ئەو کوڕەی کە شامیل لە سەر چیاوە هەڵیداشت و هەپروون بە هەپروون بوو. بەڵام ئەم ڕووداوە دواتر ڕووی دا.

نزیکەی شازدە ساڵم تەمەن بوو کە مریدەکان پێیان بۆ گوندەکەمان کرایەوە. بە خەنجەری داریین لە بەردەکانیان دەدا. هاواریان دەکرد: «موسوڵمانان کاتی غەزایە!» چێچێنییەکان هەموو بوونە لایەنگری مریدەکان. ئاڤارەکانیش دەستە دەستە دەچوونە ڕیزی ئەوانەوە. ئەو کاتە وەک براکانم لە کۆشک و دیوەخانی خانەکان دەژیام. ڕۆژگارێکی خۆشم ڕادەبوارد: دەوڵەمەند بووین. ئەسپم هەبوو. چەک و پارەم هەبوو. زۆر خۆشم ڕادەبوارد؛ هەتا ئەو کاتەی ئیمام قازی مەلا کوژرا و هەمزە بوو بە جێگری. هەمزە نوێنەری خۆی بۆ هەموو ناوچە و مەڵبەندێک نارد و هەڕەشەی لێکردن ئەگەر نەچنە ڕیزی هێزەکانییەوە ماڵ و ژیانیان دەسووتێنێ. ڕاسپاردەی نارد بۆ گوندەکەی ئێمە و هەڕەشەی کردبوو ئەگەر نەچنە پاڵی خاکی خوونزاخ بە توورەکە دەکێشێ.

بڕیارێکی ئاسان نەبوو. خانەکان لە سوپای ڕووس دەترسان. لە لایەکی دیکەشەوە ترسەنۆک بوون و نەیاندەوێرا بچنە ڕیزی چەکدارانی جیهادەوە. خانی گەورە منی لەگەڵ ئاغاخان نارد بۆتفلیس تاکوو یارمەتی لە فەرماندەی ڕووسەکان بارۆن ڕۆزێن[55] بخوازین.

---

55- Baron rosen

ئەو بەڵێنی دا یارمەتیمان بدات، بەڵام بەڵێنەکەی بەجێ نەهێنا. تەنیا ئەفسەرەکانی بە ڕۆژدا لەگەڵ ئێمە دەهاتن بۆ ئەسپ سواری و لەگەڵ ئاغاخان پاپەزێنیان دەکرد. شەرابیان دەرخوارد دەدا بۆ ئەوەی سەر خۆش بێ و دەیانبرد بۆ شوێنی نەشیاو. ئەوی بووی لە چنگیان دەرهێنا. هەموو ماڵ و سامانەکەی پێ دۆڕاندن. قەڵافەتی دەتگوت ورچە، ئازا و بە جەرگ و دڵشێر بوو، بەڵام کەسایەتییەکی ڕووخاو و ئابڕووتکاو بوو. لە بەر دەستی ئەواندا وەکوو مێووڕۆنی لێ هاتبوو. ئەگەر پێشم پێ نەگرتایە دوایین ئەسپ و تفەنگەکەشی لە قوماردا دەدۆڕاند. دوای سەفەری تفلیس بوو کە بیروڕام گۆڕا. داوام لە خانی گەورە کرد بچێتە ڕیزی خەباتکارانی جیهادەوە.»

لۆریس ملیکۆڤ لێی پرسی: «بۆ چی بیروڕات گۆڕا و ڕقت لە ڕووسەکان هەستا؟»

حاجی مراد تۆزێ مات بوو. پاشان چاوی قووچاند و بە توندی گوتی: «هۆکارێکی دیکەشم بوو بۆ چوونە پاڵ چەکدارانی جیهادەوە.»

«چ هۆکارێک؟»

«کە گەیشتنە ناوچەی تفلیس لەگەڵ سێ کەس لە مریدەکان بەرە و ڕوو بووین. دوو کەسیان هەڵاتن، یەکیانم بە گوللە پێکا. کاتێک چووم تفەنگەکەی هەڵگرمەوە هێشتا زیندوو بوو. چاوی لێکردم و گوتی: « منت پێکاو شەهیدت کردم، بەڵام دڵخۆشم. تۆ موسوڵمان و گەنج و بەتوانای؛ خودا دەخوازێ ببیە جەنگاوەری هێزی جیهاد.»

«بووی؟»

«نا، بەڵام کەوتمە بیر کردنەوە لێی و ئەو قسەیەم لە دڵ دەرنەدەچوو.»

حاجی مراد درێژەی بە گێڕانەوەی سەربردەکەی دا: «هەمزە بەرەو خوونزاخ هات. کەیخودا و ڕیش سپییەکانمان نارد بۆ لای و گوتمان ئەگەر مەلایەکی زانا بنێرن بۆمان و ڕێنوێنیمان بکات دێینە پاڵ هێزی جیهادەوە. هەمزە فەرمانی دا سمێڵی ڕیش سپییەکانمان بتاشن و لووتیان کون بکەن؛ ئەڵقەی لە لووتیان کرد و بەو شێوەیە ناردیاننەوە بۆ گوندەکە. ڕیش سپییەکان هەواڵیان هێنا کە شێخ ئامادەیە کەسێک بنێری بۆ گوندەکەمان بۆ ئەوەی ڕێنونێنیمان بکات و غەزا و جیهادمان فێر بکات بەو مەرجە خان خانم، گەنجترین کوڕی خۆی وەک بارمتە بنێرێ و لە لای ئەوان بمێنێتەوە. خان خانم قەبووڵی کرد و بوولاچ خانی نارد بۆ لای ئەوان. هەمزە میواندارییەکی باشی لێکرد و براکەی دیکەشی بانگهێشتن کرد بچن بۆ لای. هەواڵی نارد کە دەیهەوێ وەک باوکی کە خزمەتی بە خانی گەورەی ئێمە دەکرد، ئەویش خرمەت بە ئێمە بکات. خان خانم، وەک هەموو ئەو ژنانەی کە خاوەنیان نییە، نەزان و خۆپەرست بوو. دەترسا هەر دوو کوڕەکەی بنێرێ؛ تەنیا ئومما خانی نارد. منیشی لەگەڵ نارد. پێش ئەوەی بگەینە ئەوێ، مریدەکان هاتن بەرە و پیرمان. بە دەوروبەرماندا تەڕاتێنیان دەکرد و تیریان دەهاویشت و گۆرانییان دەگوت. هەمزە لە خێوەتەکەی هاتە دەرێ و هات بۆ لای ئومما خان، ڕکێفەکەی گرت و ماوەیەک وەک خان ڕەفتاری لەگەڵ کرد. پاشان گوتی: «هیچ کات دەرهەق بە خانەدانی ئێوە بێ ڕێزیم نەنواندووە و ئێستاش ئەو کارە ناکەم. تەنیا چاوەڕوانیی ئەوەم لێتان هەیە دوژمنایەتیم لەگەڵ نەکەن و ڕێگەم بدەن خەڵکی بۆ جیهاد هان بدەم و بۆ ئەو ڕێگایە ڕێنوێنییان بکەم. بە هەموو چەکدارەکانمەوە ـ هەر ئەو جۆرەی خزمەتم بە باوکتان کردووە ـ خزمەتی ئێوەش دەکەم.

ڕێگەم بدەن لەگەڵ ئێوە بژیم. بەڵێن دەدەم نەک سوودێکی باشم بۆتان دەبێ و دەبمە ڕاویژکارتان، بەڵکوو هەر کارێکی پێتانخۆشە دەتوانن بیکەن.»

ئوممـا خان کە زمانی دەیگرت، زمانی کەوتە تەتەڵە کردن و نەیدەزانی چ وەڵامێکی بداتەوە. ئەو کاتە بوو کە من گوتم واباشترە هەمزە خۆی بێت بۆ خوونزاخ تا خان خانم و خانەکانی کوڕی میوانداریی لێ بکەن، بەڵام هێشتا قسەکەم تەواو نەکرد بوو، شامیل کە لە پاڵ ئیمامدا دانیشتبوو - یەکەم جار بوو چاوم بە شامیل دەکەوت - پێی گوتم: «هیچ کەس لەگەڵ تۆ قسەی نەکردووە. ئێمە لەگەڵ خان قسە دەکەین.»

من بێدەنگ بووم. ئوممـا خان چوو بۆ نێو خێوەتەکەی هەمزە. دواتر هەمزە بانگی کردم تا لەگەڵ نوێنەرەکانی ئەو بچین بۆ خوونزاخ. چووم. نوێنەرەکان داوایان لە خان خانم کرد کوڕە گەورەکەشی بنێرێ بۆ لای هەمزە. هەستم کرد پلانێک لە گۆڕێدایە. بە خان خانمم گوت نەینێرێ، بەڵام لە قەدیمەوە گوتوویانە ژن ئەقڵی لە کۆشیدایە! داوای لە کوڕەکەی کرد بچێت. ئەبوو نووتسال خان نەیدەویست بچێ. دایکی گوتی: «وادیارە دەترسی.» خان خانم وەک زەرگەتە دەیزانی بە کوێوە بدات زۆرتر ژانی هەیە. بەو قسەیەی دایکی ئەبوو نووتسال سوور هەڵگەڕا و ئیتر هیچی نەگوت، فەرمانی دا ئەسپەکەی بۆ زین بکەن و منیش لەگەڵیدا چووم.

گەیشتمە خێوەتەکە. دیتم ئوممـا خان بە جەستەی خوێناوییەوە لە سەر زەوی کەوتبوو. ئەبوونووتسال خان لەگەڵ مریدەکان شەڕی دەکرد. لاڕوومەتێکی بریندار بوو و گۆشتەکەی شۆڕبووبۆوە. بە دەستێکی زامەکەی گرتبوو و بە دەستەکەی دیکەی هەر کەسێک لێی

نزیک دەبۆوە برینداری دەکرد. دیتم براکەی هەمزەی دا بەزەویدا. هات زەبر لە دانەیەکی تر بوەشێنێ، بەڵام لەگەڵ تەقەی مریدەکان کەوت بەزەویدا.»

حاجی مراد بێدەنگ بوو. دەموچاوە تاوەسووتەکەی سوور سوور هەڵگەڕا و چاوانی بوون بە دوو کاسەی خوێن.

«ترسا بووم... لە دەرفەت کەڵکم وەرگرت و ڕامکرد...»

لۆریس ملیکۆڤ گوتی: «بەڕاستیتە؟ من بیستبووم کە تۆ هیچ کات نەترساوی.»

«دوای ئەوە ئیتر هەرگیز نەترسام. لەو ساتەوە بۆ هەمیشە خۆم بە شەرمەزار دەزانم. هەر کاتێک ئەو ڕووداوەم وەبیر دێتەوە ترسەکەم دەشکێ...»

پاشان گوتی: «ئیتر بەسە. کاتی نوێژ کردنە.»

کاتژمێرە قورمیش دارەکەی لە گیرفانی بەرسینگی چەرکەسییەکەی دەرهێنا و قورمیشی کرد. سەعات دوازدە و چارەکی نیشان دا. حاجی مراد گوێی بۆ زەنگی گاتژمێرەکە ڕاگرت و شادییە منداڵانەکەی خۆی شاردەوە.

بە بزەیەکەوە گوتی: «ئەوە دیاریی ڤۆرۆنتسۆڤی هاوڕێمە.»

«کاتژمێرێکی باشە. بڕۆ نوێژەکەت بکە. من ماتڵت دەبم.»

حاجی مراد لە وەلامدا گوتی: «زۆر باشە» و ڕۆیشت بۆ ژوورەکەی خۆی.

# دوازده

لۆریس ملیکۆڤ کە بە تەنیا مابۆوە سەر جەمی ئەو بابەتانەی حاجی مراد گوتبووی، هەمووی لە دەفتەرەکەیدا یاداشت کرد. پاشان جگەرەیەکی داگیرساند و لە نێو ژوورەکەدا دەستی کرد بە پیاسە کردن. کە گەیشتە بەر دەرگاکەی ڕووبەڕووی گوێی لە ئاخافتن بوو بە زمانی تاتاری. زانیی دەبێ هاوڕێیانی حاجی مراد بن. دەرگاکەی کردەوە و چوو بۆ لایان.

ژوورەکە پڕ لە بۆنی چەرمێک بوو کە تایبەتی خەڵکی کوێستانە. گەمزالۆی قژسووری یەک چاو لە سەر عەبایەک دانیشتبوو کە لە تەرکی ژوورەکەدا ڕاخرابوو. بەشمیتێکی کۆن و چەور و چڵێکی لە بەر دابوو. خەریکی هۆنینەوەی هەوسارێک بوو و بە سەرسووڕمانەوە باسێکی دەگێڕایەوە. بە دیتنی لۆریس ملیکۆڤ قسەکەی بڕی و بێ ئەوەی گوێ بە هاتنەکەی بدات، درێژەی بە کارەکەی خۆیدا.

بەرەوڕووی گەمزالۆ. خان محەمەد کەیفساز و بەنەشە چاوە ڕەش و بێ مژۆڵەکانی دەدرەوشانەوە و قسەیەکی لە پەستا دووپات دەکردەوە. ئیلداری بەژن و باڵا جوان قۆڵی هەڵکردبوو و بازۆڵە قەویوقۆڵ و پڕ ماسوولکەکەی وەدەرکەوتبوو و خەریکی سڕین و بریقەدار کردنی تەنگە و پاڵووی ئەسپەکەی بوو کە بە بزمارێک بە

دیواردا هەڵواسرا بوو. خەنیفە سەر دەستە و ڕاوێژکاری حاجی مراد بوو، لە چێشتخانەکە خەریکی لێنانی شێو بوو.

لۆریس ملیکۆڤ دوای سڵاو و چاکوچۆنی پرسی: «کێشەکەتان لە سەر چییە؟»

خان محەممەد دەستومشتاخی لەگەڵ لۆریس ملیکۆڤ گرد و گوتی: «ئەوە لە پەستا تاریفی شامیل دەکات و بە شاخ و باڵیدا هەڵدەڵێ. دەڵێ شامیل مرۆڤێکی گەورە و خوێندەوار و بە جەرگە؛ یەکێک لە گەورە پیاوانە و پیاوی خودایە!»

«مەگین لە لای ئەو ڕای نەکردووە، چۆن تاریفی دەکات و بە شاخ و باڵیدا هەڵدەڵێ؟»

«لە لای ئەو ڕای کردووە و بەشاخ و باڵیشیدا هەڵدەڵێ.»

لۆریس ملیکۆڤ لێی پرسی: «هەر بە ڕاستی ئەو بە پیاوی خودا دەزانێ؟»

گەمزالۆ لە ڕێوە وەڵامی دایەوە: «ئەگەر پیاوی خودا نەبووایە خەڵکی پیڕەوییان لێ نەدەکرد.»

خان محەممەد گوتی: «شامیل پیاوی خودا نییە. بەڵام مەنسوور پیاوی خودا بوو! بە ڕاستی پیاوی خودا بوو! کاتێک ئەو پێشەوا بوو، خەڵکی بە ڕاستی جۆرێکی تر بوون. جیاوازیی ئەو سەردەمە لەگەڵ ئێستا زەوی تا ئاسمان بوو. هەر کاتێک بە گوندێکدا تێدەپەڕی خەڵکی دەهاتن ئاتەگی عەباکەیان ماچ دەکرد و تۆبەیان لە سەر دەستی دەکرد. ئەو کاتە هەموو خەڵکی، وەک ئەو پیرەپیاوە، بە چەشنی پیاوچاکان دەژیان. شەرابیان نەدەخواردەوە. جگەرەیان نەدەکێشا. هیچ کەس نوێژی نەدەچوو. تەنانەت ئەگەر خوێنی کەسێک دەڕژا لە تاوانی یەکتر خۆش دەبوون. ئەگەر کەسێک پارە یان شتێکی بە نرخی

بدۆزیبایەتەوە بە سەری داریکییەوە دەبەست و لە قەراغ ڕێگا دەیچەقاند. ئەو سەردەمە خودا مرادی هەمووانی حاسڵ دەکرد؛ نەک وەکوو ئێستا...»

گەمزالۆ گوتی: «ئێستاش لە کوێستان خەڵکی نەشەراب دەنۆشن، نە جگەرە دەکێشن.»

خان محەممەد چاوێکی لە لۆریس ملیکۆڤ قرتاند و گوتی: «شامیل کێوییە!»

گەمزالۆ وەڵامی دایەوە: «بەڵێ، کێوییە، هەڵۆکانیش کێوین!»

خان محەممەد کە وەڵامە بەجێ و دەمودەستەکەی گەمزالۆی زۆر بە دڵ بوو گوتی: «ماشەڵڵا لەو حازر جوابییەت!»

خان محەممەد کە قوتووی زێوینی جگەرەی بە دەستی لۆریس ملیکۆڤەوە دیبوو، داوای جگەرەی لێکرد. لۆریس ملیکۆڵ پرسی: «مەگین جگەرەکێشان بۆ ئێوە حەرام نییە؟»

خان محەممەد چاوێکی قرتاند و بە سەری ئاماژەی بەو ژوورە کرد کە حاجی مرادی لێبوو و گوتی: «ئەگەر حاجی مراد چاوی لێ نەبێ حەرام نییە.» جگەرەکەی لێ وەرگرت و بەپەلە کێشای. بەڵام نەیدەزانی دووکەڵەکەی قووت بدات. ناشارەزایانە بە لێوە سوورەکانی مژی لە جگەرەکە دەدا و دووکەڵەکەی دەردەدایەوە.

گەمزالۆ بە ڕق هەستاوی گوتی: «تاوان ئەنجام دەدەی!» پاشان لە ژوورەکە چووە دەرێ.

خان محەممەد چاوێکی لە لۆریس ملیکۆڤ قرتاند و گوتی لە کوێ دەتوانێ بەشمیتی هەورێشمین و بە نرخ و شەوکڵاوی سپی بکرێ؟

«مەگین ئەوەندەت پارە پێیە؟»

«خان محەممەد دیسان چاوێکی قرتاند و گوتی: «ئەرێ، ئەوەندەم پێیە.»

ئیلدار بە ڕوخساری بزە تێزاو و ڕەزاسووکەوە ڕووی لە لۆریس ملیکۆڤ کرد و گوتی: «لە ئەو بپرسە لە کوێی هێناوە؟»

خان محەممەد لە ڕێوە وەڵامی دایەوە: «بردمەوە!» گێڕایەوە کە ڕۆژی ڕابردوو کاتی گەڕان لە شەقامەکانی تفلیس تووشی تاقمێک ئەرمەنی و ڕووسی بووە کە خەریکی یاریی شێروخەت بوون. بڕی پارەکەش زۆر بووە. سێ دراوی ئاڵتوون و بڕێکی زۆر دراوی زێو. خان محەممەد خێرا چووبووە نێو یارییەکەوە. خرینگەی لە پارە مسییەکانی گیرفانی هێنا بوو و گوتبووی دەیهەوێ لە سەر هەمووی گرێو بکات.

لۆریس ملیکۆڤ پرسی: «چۆنت ئەو کارە کرد؟ مەگین ئەوەندەت پارە پێبوو؟»

خان محەممەد بە پێکەنینەوە گوتی: «نا، تەنیا دوازدە کۆپێکم پێبوو.»

«ئەگەر بتدۆڕاندبایە چیت دەکرد؟»

خان محەممەد ئاماژەی بە بەروانکەکەی کرد.

«یانی بەروانکەکەت پێدەدان؟»

«پێمدەدان؟ نا بابە! هەڵدەهاتم. ئەگەر کەسێکیش بە دوام بکەوتایە دەمکوشت. فاتیحا!»

«دەی بردتەوە؟»

«بەڵێ، هەموو پارەکەم بردەوە؛ هەڵمگرت و بۆی دەرچووم!»

لۆریس ملیکۆڤ تازە بۆی دەرکەوتبوو خان محەممەد و ئیلدار چ جۆرە مرۆڤێکن. خان محەممەد کەسێکی سەرچڵ و فێری ئاوی بێ لەغاو بوو؛ حەزی لە خۆش گوزەرانی و هەڵەخەرجی بوو. نەیدەزانی

چی لەو جۆش و کوڵ و سەرەڕۆییەی خۆی بکات. هەمیشە پێدەکەنی. کەمتەرخەم و نا دەرۆست بوو. مێشێکیشی میوان نەبوو کە یاری بە ژیانی خۆی و خەڵکی تر بکات. بە هۆی ئەو سەرچڵی و گوێ نەبیسییەوە بوو کە ئێستا لێرە بوو. ئەگەر مەیلی لێ بووایە و بۆی هەڵکەتبایە سبەینێ پشتی لە ڕووسەکان دەکرد و دەبووە لایەنگر و هاوسەنگەری شامیل. ئیلداریش بە ئاسانی دەکرا تێبگەی. مریدی گیان لە سەر دەست و سەر لە پێناوی حاجی مراد بوو، کوڕێکی هێدی و بە توانا و خاوەن وەرەبوو.

گەمزالۆی قژسووریش هیچ کەس سەری لە کارەکانی دەنەدەچووە. دیار بوو ددانی خێر بە شامیلدا نانێ و پێی وەفادار نییە. لە لایەکی تریشەوە لە هەموو ڕووسەکان بێزار بوو و نەفرەتی لێ دەکردن. بەو هۆیە مۆریس میکۆڤ نەیدەتوانی تێبگا بۆ چی ئێستا هاتۆتە پاڵ ڕووسەکانەوە. وای بە خەیاڵدا هات کە دەبێ خۆ بە دەستەوەدانی حاجی مراد و چیرۆکی دوژمنایەتیی لەگەڵ شامیل فێڵ و پیلان بێ و زۆربەی ئەفسەرەکانیش هەر بەو شێوەیان بیر دەکردەوە. پێیان وابوو حاجی مراد هاتۆتە پاڵ ڕووسەکان بۆ ئەوەی خاڵە لاوازەکانیان بدۆزێتەوە و لە دەرفەتێکی لەباردا دەگەڕێتەوە بۆ کوێستان و بەپێی ئەو زانیارییانەی بە دەستی هێناوە هێزەکانی ئامادە دەکات. ئێستاش کەسایەتیی گەمزالۆ و هەڵسوکەوتی، ئەو گومانەی لۆریس ملیکۆڤی زایاتر کرد بوو.

حاجی مراد و هاوڕێکانی دەیانزانی چۆن ویستە دەروونییەکانی خۆیان بشارنەوە، بەڵام ئەو ڕق و نەفرەتەی گەمزالۆ لە ڕووسەکانی هەبوو، نیشاندەری پیلان و ویستە دەروونییەکانی ئەوان بوو.

لۆریس ملیکۆڤ ویستی سەری قسە لەگەڵ گەمزالۆ بکاتەوە، لێی پرسی بێ تاقەت نەبووە؟

گەمزالۆ، بە مۆڕە کردن و بە منجەمنج و لەبن لێوەوە وەڵامی دایەوە: «نا، بێ تاقەت نەبووم.» هەموو پرسیارەکانی لۆریس ملیکۆڤی بە و لەبزە وەڵام دەدایەوە.

هێشتا لۆریس ملیکۆڤ لە ژوورەکە بوو کە چوارەمین هاوڕێی حاجی مراد، ئاڤار خەنیفە هاتە ژوورێ. دەموچاو و مل و سینگی کوڵکن و ئاڵۆزاو بوو. پیاوێکی بە توانا و زەحمەتکێش و هەمیشە سەر قاڵی کار و ئەرکەکانی بوو، وەک ئیلدار گوێڕایەڵ و سەر لە پێناوی حاجی مراد بوو.

هاتبوو برینج بەرێ. لۆریس ملیکۆڤ لێی پرسی خەڵکی کوێیە و لە کەنگێوە چۆتە ڕیزی هێزەکانی حاجی مرادەوە.

حەنیفە وەڵامی دایەوە: «پێنج ساڵە. خەڵکی گوندەکەی حاجی مرادم. باوکم مامی خۆی کوشتبوو. دەیانویست من بکووژن.» بە ئارامی دەدوا و ڕاست چاوی لە چاوی لۆریس ملیکۆڤ بڕیبوو. «بۆیە داوام لە حاجی مراد کرد بمکات بە برای خۆی.»

«یانی چی، بتکات بە برای خۆی؟»

«دوومانگ سەرم نەتاشی و نینۆخم نەکرد. پاشان چووم بۆ لایان.»

لە ژوورەکەی تەنیشتەوە دەنگی حاجی مراد هات. ئیلدار وەڵامی دایەوە. دەستی سڕی و بە هەنگاوی توند و خێرا ڕۆیشت بۆ ژووری میوانداری.

گەڕایەوە و بە لۆریس ملیکۆڤی گوت کە حاجی مراد دەیهەوێ بچێت بۆ لای.

لۆریس ملیکۆڤ جگەرەیەکی دیکەی دا بە خان محەمەدی شاد و بەنەشە و ڕۆیشت بۆ ژووری میوانداری.

## سێزده

له ته‌لاره‌که‌، حاجی مراد به ده‌موچاوێکی کراوه و ڕوویه‌کی خۆشه‌وه پێشوازیی له لۆریس ملیکۆڤ کرد.

له سه‌ر قه‌نه‌فه‌یه‌ک دانیشت و گوتی: «درێژه‌ی پێ بده‌ین؟»

«به‌ڵێ، با درێژه‌ی پێبده‌ین. چووم له‌گه‌ڵ هاوڕێکانت قسه بکه‌م.»

حاجی مراد گوتی: «خان محه‌مه‌د پیاوێکی هه‌ڵه‌شه و گه‌مژه‌یه.»

«ئه‌و گه‌نجه جوانچاکه‌م زۆر که‌وته به‌ر دڵ.»

«مه‌به‌ستت ئیلداره؟ گه‌نجه، به‌ڵام زۆر به جه‌رگ وره‌به‌رزه! چه‌ند چرکه‌یه‌ک بێده‌نگ بوون.»

«ده‌ته‌وێ درێژه‌ی پێبده‌م؟»

«به‌ڵێ، به‌ڵێ، فه‌رموو.»

«بۆم باس کردی خانه‌کانیان چۆن کوشت. دوای کوشتنیان هه‌مزه هات بۆ خوونزاخ و له کۆشکه‌که‌ی ئه‌واندا نیشته جێ بوو. خان خانم ته‌نیا که‌سێک بوو له‌و بنه‌ماڵه‌یه زیندوو مایه‌وه. هه‌مزه‌ی سه‌رکۆنه کرد و تووک و نزای لێکرد. هه‌مزه‌ش چاوێکی له عه‌سه‌لداری[56] مریدی قرتاند. عه‌سه‌لدار له پشته و به زه‌برێک سه‌ری په‌ڕاند.»

لۆریس ملیکۆڤ لێی پرسی: «ئه‌ویان بۆ کوشت؟»

---

56- Asaldar

«ئەی چۆن نایکووژن! ئەوانە ماریز و تینووی دەسەڵات بوون. بۆیە هەموو بنەماڵەکەیان قەلاچۆ کرد. ئەو خانەی لە هەمووان گەنجتر بوو شامیل بە دەستی خۆی کوشتی. ئەوی لە ڕەوەزێکەوە هەڵدێرا. ئەو کاتە هەموو ئاڤاریا خۆیان تەسلیمی هەمزە کرد، بەڵام من و براکەم تەسلیم نەبووین. بە ڕواڵەت وامان دەنواند کە تەسلیمی بووین، بەڵام هەمیشە لە بیری ئەوەدا بووین هەڵیکمان بۆ هەڵکەوێ و خوێنی بڕێژین. لەگەڵ باوەگەورەمان ڕاوێژمان کرد. بڕیارمان دا دەست ڕاگرین هەتا لە کۆشک دێتە دەرێ و ئەو کاتە کەمینی بۆ دانێین و حەیاتی لێ ببڕین. کەسێک گوێی لە قسەکانمان بوو بوو و خەبەری بە هەمزە دابوو. هەمزە کەسێکی نارد بە دوای باوەگەورەمدا و پێی گوت: «جوان گوێ ڕاگرە! ئەگەر ڕاست بێ کە نەوەکانت قەستی کوشتنی منیان هەیە، بە کاریتەی بەر هەیوانی ئەو کۆشکەدا هەڵتاندەواسم. من خەریکی ئەنجام دانی ئەو ئەرکەم کە خواوەند لە سەر شانی داناوم، هیچ کەسیش ناتوانێ ببێتە کۆسپی سەر ڕێگام. ئێستا بڕۆ و لە بیرت بێ چیم پێگوتی!»

باوەگەورەم هاتەوە بۆ ماڵێ و قسەکانی هەمزەی بۆ گێڕاینەوە. ئەو کاتە بوو کە بڕیارمان دا ڕۆژی یەکەمی جێژن لە مزگەوت کارەکە یەکلایی بکەینەوە. یەکی دوو دانە شەشلوولمان هەڵگرت، دەموچاومان داپۆشی و چووین بۆ مزەگەوت. هەمزە لەگەڵ سی کەس لە مریدەکانی هات بۆ مزگەوت. هەموویان شەمشیر بە دەست بوون. عەسەلدار، کە یەکێک لە مریدە باوەڕپێکراوەکانی هەمزە بوو،(هەر ئەو کەسەی سەری خان خانمی پەڕاندبوو) چاوی بە ئێمە کەوت. گوڕاندی دەموچاومان بکەینەوە و هات بۆ لای من. خەنجەرەکەم بە دەستەوە بوو؛ دەستەوبەجێ ئەوم کوشت و

پەلامـاری هەمـزەم دا. پـێش ئەوەی بـگەمە سـەری، عوسـمانی بـرام تەقەلە دەمانچەکەی هەستا و هەمزەی پێکا. بەڵام نەکەوت. دەست بە خەنجیر ئاوقـای عوسـمانی بـرام بـوو. نەمهێشـت لێـی نزیـک بێـتەوە گوللەیەکم لە تەختی نێوچاوانی دا. ئەوان سی مرید بوون و ئێمە دوو کەس بـووین. عوسـمانی بـرام کـوژرا، بەڵام مـن خـۆڕاگریم کـرد و دەرفەتم هێنا لە پەنجەرەکەوە بازم دا و خۆم دەرباز کرد.

کاتێک خەڵکی لە کوژرانی هەمزە ئاگادار بوون، ڕاپەڕین. مریدەکان ڕایانکرد و ئەوانەی نەیانتوانی خۆیان دەرباز بکەن کوژران.»

حاجی مراد بێدەنگ بوو. هەناسـەیەکی قووڵی هەڵکێشـا و درێـژەی بە قسەکانی دا: «هەتا ئێرە بارودۆخەکە باش بوو. بەڵام دواتر هەموو شتێک شێوا. شامیل جێگای هەمزەی گرتەوە. هەواڵی نـارد بچمە پاڵی و پێکەوە هەڵکوتینە سەر ڕووسەکان و بیـانکوژین؛ ئەگەر قەبووڵیشـی نەکەم هێـرش دەکـاتە سـەر خـونزاخ ئـاگری تیـبەردەدا و منـیش دەکووژێ.»

لۆریس ملیکۆڤ لێی پرسی: «دەی بۆ نەچوویە پاڵی؟»

حاجی مراد نێوچاوانی گرژ کرد و هەر ئەو ساتە وەڵامی دایەوە.

«نەمدەتوانی. ئەو دەستی بە خوێنی براکەم و ئەبوونووتسـاڵ خـان سوور بوو. چۆن ڕێگە بە خۆم دەدەم بچمە پاڵ کەسێکی ئاوا دڕنـدە و خـوێنڕێژ. ژێنـڕاڵ ڕۆزێـن نیشـانەی ئەفسـەریی پێدام و فەرمـانی دا ببمە حاکمی ئاڤاریا. بەڵام ڕۆزێن، سـەرەتا محەممەد میرزا و پاشـان ئەحمەد خـانی کردە خـانی کـازی کوومـووخ[٥٧]. ئەحمەد خـان دوژمنـی من بوو. کاتی خۆی دەیویست سەڵتەنەی کچی خان خانم بخوازێ بۆ

57- Kazi Kumukh

کوڕەکەی، بەڵام خان خانم ڕازی نەبوو. پێی وابوو خەتای منە. هەر بۆیە خان ڕقی لێ هەڵگرتم و بوو بە نەیارم. چەکدارەکانی نارد بمکووژن. بەڵام من خۆم دەرباز کرد. دوای ئەوە لە لای ژینڕاڵ کلۆگنائۆ زەمی کردم، بۆی تێ چاندبووم. گوتبووی من فەرمانم بە ئاڤارەکان کردووە هێزنگ و سووتەمەنی بە سەربازانی ڕووس نەدەن. گوتبووی مێزەرم لە سەر ناوە (حاجی مراد دەستی لە مێزەرکەی سەری دا) مێزەر لە سەر بەستنیش مانای وابوو کە من چوومەتە ڕیزی هێزەکانی شامیلەوە. ژینڕاڵ بڕوای بە قسەکانی نەکردبوو. هەر بۆیە فەرمانی دا هیچ کەس کێشە و گرفتم بۆ ساز نەکات. بەڵام کاتێک ژینڕاڵ چووم بۆ تفلیس، ئەحمەد خان سەربەخۆ دەستەیەک چەکداری نارد و قۆڵبەستیان کردم. بە زنجیر دەست و لاقیان جەڕەبابە دام و لە بەر لوولەی تۆپهاوێژ ڕایانگرتم.

شەش ڕۆژ بەو شێوەیە بەستیانمەوە. ڕۆژی حەوتەم دەست و قاچیان کردمەوە و ویستیان بمبەن بۆ ئەنجومەنی تیمیرخان. چڵ چەکداری ئامادەم لەگەڵدا بوو. دەستیان توند شەتەک دابووم و دەمزانی فەرمانیان پێدراوە بمکووژن.

کاتێک گەیشتینە نزیک مەنسۆخا[58] ڕێگاکە زۆر باریک دەبۆوە. دەستەڕاستی ڕێگاکە دۆڵێکی چڕ بوو کە نزیکەی سەدوبیست یارد قووڵ بوو. خۆم لە قەراغی ڕێگاکە نزیک کردەوە. چوومە لێواری هەڵدێرەکە. سەربازێک هات پێشم پێبگرێ. پیلیم گرت و ئەویشم لەگەڵ خۆم کێشا و لە ڕەوەزەکەوە هەڵدرێردراین. سەربازەکە هەر لە ڕێوە گیانی لە دەست دا. منیش ئەوە دەبینی هێشتا زیندووم. دەست

---

58- Manaokha

و سەر و لاق و پەراسووەکانم شکان. ویستم بە سینگەخشکی بڕۆم و خۆم دەرباز بکەم. سەرم لە گێژەوە هات؛ لە هۆش خۆم چووم. کاتێک بە هۆش هاتمەوە هەموو گیانم شەڵتانی خوێن بوو. شوانێک چاوی پێم کەوت؛ خەڵکی بانگ کرد و بردیانم بۆ گوندەکەیان. دەست و قاچ و پەراسووەکانیان بۆ هەڵبەستمەوە و برینەکانیان بۆ پێچام. دەستە شکاوەکەم و برینەکانم چاک بوونەوە؛ لاقیشم چاک بۆوە و ژانی شکا، بەڵام یەکیان خواری گرتەوە، بۆیە ئێستا تۆزێک دەشەلم.»

حاجی مراد لاقە شکاوەکەی کە خواری گرتبووە ڕایکێشا و گوتی: «بەڵام هێشتا کەڵکی ماوە و لە کار نەکەوتووە؛ لە خودا بەزیاد بێ. پاشان خەڵکی ئاگادار بوون. چاک بوومەوە و چووم بۆ تسلمیس. ئاڤارەکان ویستیان دیسان ببمەوە بە حاکمیان.» بە هێوری و جۆرێ لووتبەرزییەوە درێژەی بە قسەکانی دا: «منیش قەبووڵم کرد.»

بەپەلە لە جێی خۆی هەستا. جانتایەکی چکۆڵەی لە تێرەکەی دەرهێنا. دوو نامەی چرچولۆچ و ڕەنگ بواردووی دەرهێنا. یەکیانی دایە دەست لۆریس ملیکۆڤ. نامەکە هی ژینراڵ گلۆگنائۆ بوو. لۆریس ملیکۆڤ نامەکەی خوێندەوە. ناوەرۆکەکەی بەم شێوەیە بوو:

«ملازم حاجی مراد، لە ژێر فەرمانی مندا خزمەتت کردووە و لێت ڕازیم، هەر بۆیە بە کەسێکی باش و هێژات دەزانم. ماوەیەک لەمەوبەر ئەحمەد خان پێی ڕاگەیاندم کە تۆ بوویەتە کەسێکی خیانەتکار. دەڵێن مێزەرت لەسەرناوە. لەگەڵ شامیل پێوەندیت هەیە و خەڵکی بە دژی دەوڵەتی ڕووسیا هان دەدەی. فەرمانم دا قۆڵبەستت بکەن و بتهێنن بۆ لام، بەڵام بۆ ڕاتکردووە. نازانم ئەمانە بۆ تۆ باشە یان خراپ. نازانم تاوانباری یان بێ تاوان.

وتەکانم لە بەر چاو بگرە. ئەگەر ویژدانت ئاسوودەیە و خیانەنت بە تێزار نەکردووە، وەرە بۆ لام و خاترجەم بە پارێزراو دەبێ. خۆم بەرەڤانیت لێدەکەم. خان ناوێری ئازارت پێ بگەیێنێ. ئەو لە ژێر فەرمانی مندایە و لە قسەم دەرناچێ؛ کەوایە خەمی هیچت نەبێ.

گلۆگنائۆ گوتبووشی هەمیشە لە سەر بەڵێنەکەی خۆی سوور دەبێ و پێداگریی کرد بوو کە حاجی مراد لە زووترین کاتدا بچێت بۆ لای.

لۆریس ملیکۆڤ ئەو نامەیەی خوێندەوە. حاجی مراد بەر لەوەی نامەی دووهەمی بداتێ گوتی یەکەم نامەی بەم شێوەیە وەڵام داوەتەوە:

«نووسیم: ئەگەر مێزەرم لە سەر ناوە لە بەر دڵی شامیل نەبووە. دەمویست دوای مردم خودا لە تاوانم خۆش بێ. نە حەزم لێبوو نە دەمویست بچمە پاڵ شامیل. ئەو بووە هۆی مەرگی باوکم و براکانم و هەموو خزم و کەسەکانم. ئیتر چۆن دەتوانم پاڵی وێدەم؟ ئابڕووم چوو بوو، (لە خوونزاخ کاتێک قۆڵبەست کرا بوو، کەسێکی خوێڕێ تفی لە نێو چاوانم کرد و هەتا ئەو بۆرەکەی خوێڕییە نەکووژم ناتوانم لە لای ئێوە سەر هەڵێنم). بەڵام لە هەموو ئەوانە زیاتر ترسی ئەحمەد خانی درۆزن و ناپاکم لە دڵدا بوو.»

حاجی مراد کاغەزێکی چرچولۆچی دیکەی لە باخەڵی دەرهێنا، دای بە لۆریس ملیکۆڤ و گوتی: «ئەو کاتە ژینراڵ ئەم نامەیەی بۆ ناردم: «لەوەی کە وەڵامی نامەکەت دامەوە سپاست دەکەم. نووسیوتە دەترسی بێی بۆ لامان چونکە بۆرەپیاوێکی خوێڕی سووکایەتیی پێکردووی و هەر ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوەی لە هاتن خۆت ببوێری. بەڵام دڵنیات دەکەم یاسای ڕووسەکان ئەو هەلەت بۆ دەڕەخسێنێ کە

ئەو بۆرەپیاوە خوڕییە لە بەر چاوی خۆت سزا بدرێ. هەر ئەمڕۆ فەرمـــانم داوە پێوشـــوێنی ئەو مەســـەلەیە بگـــرن و ئەو خـــوێڕییە قۆڵبەست بکەن.

حاجی مراد، باش سەرنج بدە. من ناهەقم نیە گلەییت لێبکەم کە بڕوا بە وتەکانی من و شەرەفی من ناکەی. بەڵام تەنیا بەو هۆیە لە تۆ خۆش دەبم چونکە دەزانم ئێوە خەڵکی کوێستان لە هەموو شتێک بەگومانن.

ئەگەر ویژدانت ئازارت نادات، ئەگەر تەنیا بەو قەستە مێزەرت لە سەر ناوە کە خودا لێت خۆشبێ، هەقت بەدەستە و دەبێ بتوانی بە دڵنیایی و بەبێ دوودڵی لەگەڵ ڕووسەکان بەرەوڕوو بێ. بەڵێنیشت دەدەمێ ئەو کەسەی سووکایەتیی پێکردووی سزا دەدرێ و هەموو ماڵ و سامانە زەوت کراوەکەت بۆ دەگێڕینەوە. جا ئەو کاتە تێدەگەی یاسـای ڕووسـەکان چۆنە و بە چ شێوەیەک هەق بە هەقدار دەدرێ. جگە لەوەش دەبێ ئەوە بزانی کە ڕوانگەی ئێمەی ڕووس سەبارەت بەڕووداوەکان لەگەڵ ڕوانگەی ئێوە جیاوازە. ئەگەر کەسێکی سووک و خوێڕی سووکایەتیی بە تۆ کردووە، ڕێز و گەورەیی تۆ لە لای ئێمە کەم ناکاتەوە. من خۆم ڕێگەم بە خەڵکی گیمرین داوە مێزەر لە سەر بنێن و ئەو کارەی ئەوانیش بە کارێکی باش دەزانم. کەوایە لەو بارەوە خەمی هیچت نەبێ. لەگەڵ ئەو کەسەدا کە نامەکەت بۆ دێنێ وەرە بـۆ لام. ئەو کەسـێکی دڵسـۆز و وەفـاداری مـنە و نـۆکەری دوژمنەکانی تۆ نییە. ئەو دۆستی کەسێکە کە دەوڵەت ڕێزێکی تایبەتی بۆ دادەنێ.» لە درێژەی نامەکەدا کلووگنائۆ دیسان حاجی مرادی هان دابوو بچێتە پاڵی.

دوای ئەوەی لۆریس ملیکۆڤ نامەکەی خوێندەوە، حاجی مراد گوتی: «لەگەڵ ئەوەشدا نەچووم بۆ لای کلووگناوئۆ. دوژمنی سەرەکیی من ئەحمەد خان بوو و دەبوو تۆڵەی لێ بکەمەوە. کارێک کە ڕووسەکان لە دەستیان نەدەهات. پاشان ئەحمەد خان تسلمیسی گەمارۆدا. دەیویست دەستگیرم بکات و بمکوژێ. ئێمە چەند کەس بووین. نەماندەتوانی گەمارۆکە تێک بشکێنین و خۆمان دەرباز بکەین. هەر ئەو کاتە نوێنەری شامیل هات بۆ لام و نامەیەکی شامیلی دایە دەستم، بەڵێنی دابوو یارمەتیم بدات بۆ شکست دانی ئەحمەد خان و کوشتنی و هەر وەها نووسیبووی دەمکاتە حاکمی ئاڤاریا. ماوەیەک بیرم لێ کردەوە. ئاخری چوومە ڕیزی هێزەکانی شامیل و لەو کاتەوە لەگەڵ ڕووسەکان دەستم کرد بە شەڕ.»

پاشان حاجی مراد بە وردی دەستی کرد بە گێڕانەوەی داستانی تێکهەڵچوونە قارمانانەکانی خۆی لەگەڵ ڕووسەکان. لۆریس ملیکۆڤ داستانی زۆربەی ئەو شەڕ و قارەمانێتییانەی بیستبوو. تەواوی تێکهەڵچوون و شەویخوونەکانی ئەو بە هۆی خێرایی لەڕادەبەدەر و بوێری و ئازایەتی و هەڵمەت بردن، سەرکەوتووانە بوون.

لە کۆتایی سەربردەکەیدا حاجی مراد گوتی: «هیچ کات لەگەڵ شامیل دۆست نەبوو. ئەویش هەم پێویستی بە منە و هەم لێشم دەترسێ. ماوەیەک لەمەوبەر کەسێک لێی پرسیم دوای شامیل کێ دەبێتە ئیمام؟ لە وەڵامیدا گوتم: «هەر کەس شمشێرەکەی تیژتر بێ.» ئەو قسەیان بۆ شامیل گێڕابۆوە. بۆیە دەیویست بە هەر شێوەیەکە من لە سەر ڕێگای خۆی لابەرێ. منی نارد بۆ تەبساران[59]. منیش

59- Tabsaran

چـووم هەزار سـەر مەڕ و سێسـەد ئەسـپم سـاند. بەڵام ئەو گـوتی کارەکەم بە باشی ئەنجام نەداوە و پلەی جێگریی خۆی لێ سەندمەوە. فەرمـانی دا هەمـوو پارەکـانم بـۆ ئەو بنێـرم. منـیش هەزار دراوی ئـاڵتوونم بـۆ نـارد. مریـدەکانی نـارد. هەمـوو مـاڵ و سـامانەکەیان بە تالان بردم. فەرمانی دا بچم بۆ لای؛ دەمزانی دەیهەوێ بمکوژێ، بۆیە نەچـووم. مریـدەکانی نـارد قۆڵبەسـتم بـکەن؛ خـۆم بەدەسـتەوە نەدا و بەربەرەکـانێم کـرد. پاشـان خـۆم تەسـلیمی ڤۆرۆنتسـۆڤ کـرد. کێشـەکەش لەوە دایە بنەمـاڵەکەم لەگەڵ خـۆم نەهێنـاوە. دایکـم و هاوسـەرەکەم و منـداڵەکانم لە ژێـر دەسـتی ئەودان. بە سـەردار بڵـێ هەتا ئەو کاتەی بنەماڵەکەم دیلی دەستی شامیل بن من هیچ کارێکم لە دەست نایە.»

«باشە پێی دەڵێم.»

«ئەو زەحمەتەم بۆ بکێشە و هەر کارێک لە دەست هات بیکە؛ هەر چی هەمە پێشکەشت بێ، بەو شەرتەی یامەتیم بدەی و کارێک بکەی شـازادە متمـانەم پـێ بکـات و لـێم تێبگـات. چـونکە مـن بە گورسـێک بەسـتراوەمەوە کە سـەرەکەی تـری بە دەسـتی شـامیلەوەیە.» بەو ڕستەیە، حاجی مراد وتەکانی خۆی کۆتایی پێهێنا.

# چارده

ڕۆژی بیستەمی دیسامبر ڤۆرۆنتسۆڤ ڕاپۆرتێکی بە زمانی فەڕەنسی بۆ چیرنیشۆڤ[٦٠] وەزیری جەنگ نووسی:

«شازادەی خۆشەویست! بە پۆستەی پێشوودا نامەیەکم بۆ بەڕێ کردی، سەرەتا دەمویست بڕیار بدەم چی لە حاجی مراد بکەم. دوو سێ ڕۆژی ڕابردووش نەخۆش بووم.

لە نامەکەی پێشوودا پێم ڕاگەیاندی کە حاجی مراد هاتووە بۆ ئێرە. ڕۆژی هەشتەم گەیشتە تفلیس و ڕۆژی دوایی چووم بۆ چاوپێکەوتنی. لە ماوەی حەوت هەشت ڕۆژی ڕابردوودا قسەم لەگەڵ کردووە و بیرم لێ کردۆتەوە کە لە داهاتوودا چۆن کەڵکی لێوەرگرم. بەتایبەت ئێستا چیی لەگەڵ بکەم. لە ڕادەبەدەر پەرۆشی بنەماڵەکەیەتی هەر جارێک چاوم پێی دەکەوێ ڕاشکاوانە دەڵێ هتا بنەماڵەکەی لە چنگی شامیلدا بێ، دەستی لە گۆزەدایە و ناتوانێ هیچ خزمەتێکمان پێ بکات، تاکوو قەرەبووی ئەو میوانداری و ڕەفتارە گەرموگوڕ و دۆستانەیە بکاتەوە کە لەگەڵیدا کردوومانە، ڕێزمان بۆ داناوە و چاوپۆشیمان لە تاوانەکانی کردووە.

خەم و پەرۆشیی بنەماڵەکەی زۆری خەمۆک و دڵتەنگ کردووە. ئەو کەسانەی ڕامسپاردوون لەگەڵیدا بژین پێیان ڕاگەیاندووم کە

---

60- Chernyshov

شەوانە خەو ناچێتە چاوی. خەو و خۆراکی لە خۆی حەرام کردووە. لە پەستا نوێژ دەکا. تەنیا داخوازیشی ئەوەیە ڕۆژانە ڕێگەی پێبدرێ لەگەڵ چەند کەسی کازاخ غارە ئەسپ و تەڕاتێن بکات. تەنیا سەرگەرمی و وەرزشێک کە خووی پێگرتووە و ناتوانێ وازی لێبێنێ، ئەو ئەسپ سوارییەیە. هەموو ڕۆژێک دێت بۆ لای من بۆ ئەوەی بزانێ هەواڵی بنەماڵەکەیم هەیە یان نا. داوا دەکا ئەوی بەندیی سیاسیمان هەیە لە هەمبەر بنەماڵەکەیدا لەگەڵ شامیل ئاڵوگۆڕیان پێبکەین. هێندێک پارەشی هەیە و ئامادەیە بۆ ئەو کارە خەرجی بکات. کەسانێکیش هەن کە ئامادەن بۆ ئەو کارە یارمەتیی بدەن. بەردەوام داوا دەکات و دەڵێ: «بنەماڵەکەم ڕزگار بکەن بۆ ئەوەی بتوانم خزمەتتان پێبکەم». (خۆشی حەز دەکا لە بەرەگەی شەڕی لیزگییەکان خەبات بکات.) دەڵێ ئەگەر لە ماوەی مانگێکدا خزمەتێکی بەر چاوم پێنەکردن، چۆنتان بە باش زانی سزام بدەن. لە وەڵامیدا دەڵێم: هەموو ئەو قسانە وایە، بەڵام لە نێو ئێمە ڕووسەکانیشدا کەسانێک هەن کە تا ئەو کاتەی بنەماڵەکەی لە بەر دەستی شامیلدایە ـ نەک وەک بارمتە لە لای ئێمە ـ بڕوا و متمانەی پێناکەن. بۆ کۆکردنەوەی بەندییە سیاسییەکان هەموو توانایی و دەسەڵاتی خۆم بە کار دێنم. یاساکانی ئێمە جگە لەو برە پارەیەی خۆی دەتوانێ بیدات، ڕێگەیان پێنادا پارەی دیکە بۆ ئازاد کردنی بارمتەکان خەرج بکەین. لەگەڵ ئەوەشدا من هەوڵی خۆم دەدەم. پاشان بە ڕاشکاوی پێم گوت بە بڕوای من شامیل بە هیچ شێوەیەک ڕازی نابێ بنەماڵەکەی ئەو ئازاد بکات. پەیامی بۆ دەنێرێ بگەڕێتەوە بۆ لای؛ بەڵێنیش دەدا لێی ببوورێ و پلەوپایەکەی پێشووی پێدەداتەوە. تەنانەت لەوانەیە هەڕەشە لە حاجی مراد بکات ئەگەر نەگەڕێتەوە بۆ ڕیزی هێزەکانی شامیل دایکی و

ژنەکەی و شەش منداڵەکەی دەکووژێ. داوام لێکرد ڕاشکاوانە پێم بڵێ ئەگەر شامیل پەیامێکی لەو شێوەیەی بۆ بنێرێ چی دەکات. سەری هەڵبڕی دەستی بەرە و ئاسمان بەرز کردەوە و گوتی هەموو شتێک لە دەستی خواوەند دایە. بەڵام هیچ کات خۆی بە دەستەوە نادات و ترسەنۆکانە ناچێتە بەر دەستی دوژمنەکەی. دڵنیایە کە شامیل هەرگیز لێی خۆش نابێ، چونکە تەمەنی هێندەی بە بەرەوە نەماوە. بەڵام سەبارەت بە لە نێو بردنی بنەماڵەکەی دەڵێ شامیل ئەو کارە ناکات. لە لایەکەوە نایهەوێ لەوە زیاتر حاجی مراد بکاتە دوژمنی خۆی؛ لە لایەکی تریشەوە زۆربەی خەڵکی دەستڕۆیشتووی داغستان ڕێگە نادەن شامیل ئەو کارە بکات. لە کۆتایشدا چەند جار دووپاتی کردەوە کە هەر چارەنووسێک خواوەند بۆ داهاتووی ئەوی مقەدەر کردبێ بە باوەشی ئاواڵەوە قەبووڵی دەکات. لە ئێستادا فیکر و زیکری لە لای بنەماڵەکەیەتی. داوای لێکردم لە بەر ڕەزای خودا ڕێگەی پێبدەم بچێت بۆ گرۆزنی[61]. دەڵێ لەوێ دەتوانێ بە یارمەتی و ڕەزایەتی فەرماندەرانی ئێمە پێوەندی بە بنەماڵەکەیەوە بکات و لە حاڵوباڵیان ئاگادار دەبێ و ڕێگایەک بۆ ڕزگار کردنیان دەدۆزێتەوە. دەڵێ زۆربەی خەڵکی ئەوێ، تەنانەت ئەو کاربەدەستانەی لە ژێر دەسەڵاتی دوژمنانی ئێمەدا حوکمڕانی دەکەن، هۆگری ئەون و لە قسەی دەرناچن. دەتوانێ بە یارمەتیی ئێمە لەگەڵ ئەو خەڵکە پێوەندی بگرێ کە ئێستا لە ژێر فەرمان و دەسەڵاتی ڕووسەکاندان یان بێ لایەنن و دەتوانن بۆ ڕزگاریی بنەماڵەکەی یارمەتیی بدەن، بۆ ئەوەی ئەو بە دڵێکی ئاسوودەوە خزمەتمان پێبکات و متمانەی ئێمە بە

61- Grozny

دەست بێنی. داواکارە لەگەڵ دەستەیەک کازاخ بینێرین بۆ گرۆزنی، بۆ ئەوەی لە مەترسیی دوژمنەکانی بە دوور بێ و ئێمەش دڵنیا بین کە لە ژێر فەرمانی ئێمە دایە.

شازادەی بەڕێز، حەتمەن تێدەگەی لەگەڵ چ کێشەیەکی ئاڵۆز بەرەوڕووم و چ بەرپرسایەتییەکی قورسم لە سەر شانە. ئەوپەڕی کەمتەرخەمییە ئەگەر سەتاسەت متمانەی پێبکەین. ئەگەر بشمانەوێ بە ڕاستی خەیاڵمان ئاسوودە بێ و دڵنیا بین ڕاناکات، هیچ ڕێگەچارەیەکمان نییە جگەی لەوەی زیندانیی بکەین. کارێک کە بە بڕوای من نەک زاڵمانەیە بەڵکوو زۆریش کارێکی ناجوامێرانەیە. هەنگاونانێکی لەو شێوەیە کە هەواڵەکەی لە سەرانسەری داغستاندا بڵاو دەبێتەوە، زیانێکی زۆرمان پێدەگەیێنێ. چونکە زۆرن ئەو کەسانەی بە ئاشکرا یان بە نهێنێ دژبەری شامیلن و گوێ قوڵاخن بۆ ئەوەی بزانن لەگەڵ بوێرترین و بەجەرگترین هاوسەنگەری ئیمام کە خۆی تەسلیمی ئێمە کردووە چۆن هەڵسوکەوت دەکەین. ئەگەر حاجی مراد بەند بکەین، هەموو بەرژەوەندییەکان وزئەو هەلانەی بۆمان ڕخساوە ڤەشەل دێنێ.

کەوایە بە بڕوای من ئەو سیاسەتانەی تا ئێستا بە کارمان هێناوە باش و دروست بووە. کارێکی دیکەشمان پێنەدەکرا. بەڵام دەزانم ئەگەر حاجی مراد پەژیوان بێتەوە و ڕابکاتەوە بۆکوێستان بە تاوانی هەڵەکردن تۆمەتبار دەکریم. لە بواری نیزامیدا، بەتایبەت لە بارودۆخێکی ئاوا هەستیاردا، ئەگەر مەحاڵیش نەبێ، لانیکەم زۆر بە دژواری پیاو دەتوانێ ڕێگای بێ هەڵە هەڵبژێرێ و بەرپرسایەتی بگرێتە ئەستۆ. بەڵام ئەگەر ڕێگایەکت بە باش زانی وا باشە درێژەی پێبدەی و چاوەڕوانی ئاکامەکەی بی.

شـــازادەی بەڕێــز! وێــڕای لە بەر چــاو گرتنــی هەموولایەنەکــان، داواکارم ئەم عەریزەیەم بۆ سەرنج پێدان و متالا ئاڕاستەی هەنتەشی خاوەن شکۆ ئیمپڕاتۆر بکەن؛ چونکە بۆ من ئەو پەڕی شانازییە ئەگەر ئەو سیاســەتەی گرتــومەتە پــیش بە دڵــی بەڕێزیــان بــێ. هەمــوو ئەو شــتانەی لەم نــامەیەدا هــاتووە بــۆ ژینــڕاڵ ژاڤادۆڤســکی[62] و ژینــڕاڵ کازلۆڤسکی ـ یش م نووسیوە، بۆ ئەوەی کاتی دیتنی حاجی مراد لە بارودۆخەکە ئاگاداربن؛ بەتایبەت داوام لە حاجی مرادیش کردووە بە وردی گوێڕایەڵی فەرمانەکانی ژینڕاڵ کازلۆڤسکی بێ. هەر وەها پێشم ڕاگەیانــدووە کە واباشــترە لەگەڵ نوێنەرەکــانی ئــێمە وەڕێ بــکەوێ. چونکە شامیل لەوانەیە دەنگۆ بڵاو بکاتەوە کە ئێمە حاجی مرادمان زیندانی کردووە. شایانی باسە بە حاجی مرادیشم گوتووە تەنانەت لە ڤۆزدویژنســک نزیــک نەبێــتەوە. چــونکە کــوڕەکەم، کە حــاجی مــراد سەرەتا خۆی تەسلیمی ئەو کرد و ئەو بە هاوڕێی خۆی دەزانــێ، ئیتر فەرماندەی ئەوێ نییە و دەترسم ببێتە هــۆی خراپ لێک تێگەیشتن و دڵی لێم بێشێ. دیارە ڤۆزدویژنسک زۆر لە ناوچەی نیشتەجێ بوونی دوژمنانی ئێمەوە نزیکە، بەلام گرۆزنی جێگایەکی گونجاوترە بۆ ئەو دۆستانەی حاجی مراد دەیهەوێ پێوەندییان پێوە بکات.

جگە لەو بیست کازاخەی کە لە سەر داوای حاجی مراد لەگەڵی هــاوڕێ دەبــن، مــلازم لــۆریس ملیکــۆڤیش کە ئەفســەرێکی وریــا و بەتوانایە و شارەزای زمانی تاتارییە، لەگەڵی هاوسەفەر دەبێ. حاجی مراد لەگەڵ ملازمی ناوبراو زۆر نێوانێکی خۆشی هەیە. لە ماوەی ئەو دە ڕۆژەدا کە حــاجی مــراد لێــرە بــوو، لەو مــاڵەدا دەژیــا کە عەمیــد

---

62- Zavadovsky

دووهەم شــازادە تارخــانۆڤ لەودا نیشــتەجێ بــوو. ئەو فەرمانــدەی نــاوچەی شۆشــین ـ ە و بـۆ کاروبـاری ئیـداری هـاتبوو بـۆ تفلـیس. ئەفســەرێکی قابیـل و متمـانە پێکـراوە. ئەویـش توانیـویەتی متمـانەی حاجی مراد بە دەست بێنێ و هەر وەها بە تەواوی شارەزای زمانی تاتارییە.

ناســکترین و مەحرەمــانەترین نهێنیمــان لەگەڵ یەکتــر هێنــاوەتەوە گۆڕێ. ســەبارەت بە حـاجی مـراد لەگەڵ شـازادە تارخـانۆڤ ڕاوێـژم کـردووە. ئەویـش لەگەڵ مـن هـاوڕایە و پێـی وایە یـان وا باشــە بە شێوەی من لەگەڵ حاجی مراد ڕەفتار بکرێ یان بەندی بکەین و بە وردی چاومــان بە ســەریەوە بــێ، چــونکە ئەگەر خــراپە یــان بــێ ڕێزییەکمان لێ ببینێ، ئیتر نـاتوانین بە ئاسـانی لەلای خۆمـان ڕاگیری بکەین. ڕێگای دووهەم ئەوەیە شاربەدەری بکەین و بە یەکجاری لەم وڵاتەی دوور بخەینەوە. بەڵام جگە لەوەش ئەو دوو ڕێگـایەی دوایـی نەک قـازانج و بەرژەوەنـدییەکان بە هـۆی کێشــەی نێـوان شــامیل و حـاجی مـراد لە نێو دەبـات، بەڵکوو لە داهـاتوودا بەرگـری لە هەمـوو جـۆرە شـۆڕش و ســەرپێچییەکیش بە دژی شـامیل دەکـرێ. شـازادە تارخـانۆڤ لە ئاکـار و وتەکـانی حـاجی مـراد خـاترجەمە و متمـانەی تەواوی پێدەکات. دڵنیـایە حـاجی مـراد دەزانـی شـامیل هەرگیـز لێـی خـۆش نـابێ، ئەگەر چـی قەرار و بـڕیەی لێخۆشبوونیشـیان دانـا بـێ، ئاخری دەستی خۆی دەوەشێنێ و سەری بە گۆمدا دەکات. سـەبارەت بە حـاجی مـرادیش تەنیـا شـتێک کە بەلای تارخـانۆڤەوە دەکـرا جێـی نیگەرانـی و مەترسـی بێت بیروبـاوەڕی دینـی و مەزهەبیـی ئەو بـوو. تارخــانۆڤ پێــی وابــوو شــامیل بە هەر لەونێــک بــێ کەڵــک لەو خــاڵەلاوازەی حــاجی مــراد وەردەگــرێ و دزە دەکــاتە نێــو

بیروباوەڕییەوە. بەڵام هەر وەک باسم کرد شامیل هیچ کات ناتوانێ حاجی مراد خاترجەم بکات کە دوای گەڕانەوەی درەنگ یان زوو تۆڵەی لێناکاتەوە و بە هەر لەونێک بێ سەری بە گۆمدا ناکات.

شازادەی بەڕێز! ئەوە ئەو بابەتە بوو کە سەبارەت بە ڕووداوەکانی ئەم چەند ڕۆژە دەبوو پێتانی ڕابگەیێنم.

# پازده

ڕاپۆرتەکە، ڕۆژ بیست و چوارەمی دیسامبری 1851 لە تفلیسەوە بەڕێکرا. تەتەر کە یەک ـ دوو جووت ئەسپی لە پێ خستبوو و پێش تەتەرەکانی تر کەوتبوو، بەیانیی ڕۆژی یەکەمی ساڵی نوێ گەیشتە شوێنی مەبەست و ڕاپۆرتەکەی ڕادەستی چیرنیشۆڤ، وەزیری بەرگری کرد. چیرنیشۆڤیش ڕۆژی یەکەمی ژانویەی1852 ڕاپۆرتەکەی ڤۆرۆنتسۆڤی لەگەڵ باوەشێک کاغەز و بەڵگەنامەی تر بۆ ئیمپراتۆر نیکۆلا برد.

چیرنیشۆڤ زۆری ڕق لە ڤۆرۆنتسۆڤ بوو. نەک بەو هۆیەی ڤۆرۆنتسۆڤ لە لای هەمووان ڕێزی هەبوو و زۆریش ساماندار و یەکێک لە خانەدانە ڕەسەنەکان بوو ـ لە حاڵێکدا چیرنیشۆڤ تازەپیاکەوتوویەکی نۆکیسە بوو ـ بەڵکوو ئێرەیی بەو ڕێز و متمانەیە دەبرد کە ئیمپراتۆر دەرهەق بە ڤۆرۆنتسۆڤ هەیبوو. هەر بۆیە لە دەرفەتێک دەگەڕا زەبرێک لە ڤۆرۆنتسۆڤ بوەشێنێ و لە بەر چاوی ئیمپراتۆر سووکی بکات.

دوایین جار کە ڕاپۆرتێکی سەبارەت بە کاروباری قەفقاز پێدا بوو، توانیبووی کارێک بکات کە ئیمپراتۆر لە ڤۆرۆنتسۆڤ دڵمەند بێ. چونکە بە هۆی کەمتەرخەمیی فەرماندەرانەوە چیانشینەکان توانیبوویان مەفرەزەیەکی سوپای ڕووس تەفروتوونا بکەن. ئێستاش

قەستی ئەوەی بوو ڕەفتاری ڤۆرۆنتسۆڤ لەگەڵ حاجی مراد چەواشە بنوێنێ و بۆی تێبچێنێ.

دەیویست ئیمپراتۆر وا تێبگێنێ کە کارەکانی ڤۆرۆنتسۆڤ هەمیشە بە زیانی ڕووسەکانە و لایەنگری لە خەڵکانی دانیشتووی کوێستان دەکات؛ ئەوەش کە ڕێگەی بە حاجی مراد داوە لە قەفقاز بمێنێتەوە مەترسییەکی گەورەیە بۆ سەر بەرژەوەندییەکانی سوپای ڕووس و هەموو بەڵگەکان نیشاندەری ئەوەن کە ئەو کابرا یاغییە بۆ سیخوڕی هاتووە و دەیەوێ لە بارودۆخ و توانییەکانی سوپاکە ئاگادار بێ. بۆیە واباشترە بینێرن بۆ ناوچەکانی ئاسیای ناوەندی هەتا ئەو کاتەی بنەماڵەکەی لە دەست چیانشینەکان ڕزگار دەکرێن و یەکڕەنگی و وەفادارییی ئەومان بۆ دەردەکەوێ.

بەڵام پلانەکەی چیرنیشۆڤ سەری نەگرت، ئەویش بەو هۆیە بوو کە لەو ڕۆژەدا و لە سەرەتای ساڵی نوێدا، بە هۆی سەرقاڵی و کاروباری سوپاوە زۆر بێتاقەت بوو، هەر بۆیە بە چەقی نەحلەتا چووبوو و پێشنیاری هیچ کەسی وەرنەدەگرت، لە لایەکی تریشەوە حەزی بە دیتنی چیرنیشۆڤ نەدەکرد و ڕقی لێیبوو. ئەگەر بە هۆی هێندی کاروباری سەربازییەوە نەبووایە کە بوونی ئەو پێویست بوو، چاوی بەرایی نەدەدا بیبینێ. وەک پیاوێکی خوێڕی و بەدزاتی دەهاتە بەر چاو، چونکە لە کاتی دادگایی کردنی دێکامبریستەکاندا[63] هەوڵی دابوو زاخاری چیرنیشۆڤ سزا بدرێ بۆ ئەوەی دەست بە سەر ماڵ و سامانەکەیدا بگرێ. هەر بۆیە بە هۆی بێتاقەتی و بەدخولقی نیکۆلاوە حاجی مراد توانیی لە قەفقاز بمێنێتەوە؛ ڕەنگە ئەگەر

63- Decembrists

چێرنیشۆڤ لە هەلومەرجێکی تردا ئەو ڕاپۆرتەی پێ ڕابگەیەندبایە، تووشی بارودۆخێکی تر بووایە.

سەعات نۆ و نیو بوو و فەیتوونەوانی زەبەلاح و ڕیش درێژی چێرنیشۆڤ کە کڵاوێکی مەخمەری شینی نووک تیژی لە سەر نابوو و لە وەتاغی فەیتوونەکەیدا کە وەک وەتاغی فەیتوونەکەی نیکۆلا وابوو، قیت دانیشتبوو و بە نێو تەمومژی چڕ و ساردی زستاندا، کە لەو کاتەدا قیرات سیزدە پلە ژێر سیفری پیشان دەدا، تێپەڕی و گەیشتە کۆشکی زستانیی ئیمپراتۆر. بە سەر و دەستی سڵاوی لە هاوکارەکەی کرد کە فەیتوونەوانی پرەنس دۆلگارووکی[٦٤] بوو. ئەویش پرەنسی هێنا بوو بۆ کۆشک و ماوەیەکی زۆر بوو پاڵتۆیەکی ئەستووری لە خۆی پێچابوو و دەستی لێک هەڵدەساوی بۆ ئەوەی گەرمی بێتەوە.

چێرنیشۆڤ کەرکەیەکی درێژی بە شانیدا دابوو کە دەوری ملیوانەکەی پێستی زەرد و مەیلە و زیوینی سمۆرە بوو، کڵاوێکی سێ سووچیشی بە پێی ڕێسا لەسەرنابوو. پاپۆشی پێستی نێو عارەبانەکەی لە لاقە سڕ و سەرما تێزاوەکانی پێچا بوو، چونکە کڵاش و بەلەکپیچی لە پێدا نەبوو. ( یەکێک لە شانازییەکانیشی ئەوە بوو کە کڵاش و پووزەوانە لە پێ ناکات.) تەقەی لە مامزەی کەوشەکانی هێنارو ڕەپ و ڕاست بە قاڵدرمەکاندا وەسەرکەوت. پێشخزمەت بە ڕێزەوە دەرگای تەلارەکەی بۆ کردەوە. چووە ژوورێ. کەرکەی لە شانی داماڵی. چوو بۆ بەر ئاوێنەکە و کڵاو پرچە لوولەکەی ڕاستەوپاستە کرد. بە پێی خووخدە دەستێکی بە فۆکلە و ڕیشیدا هێنا.

64- Dolgaruki

چاوی لە میدالیا و نیشانەکانی سەر شانی و سینگی کرد و بە کاوەخۆ لە قالدرمە فەرش کراوەکان چووە سەرێ. لاقە سڕ و کەسیرە بووەکانی بە بێ هێزییەوە لە پلەنەوییەکان وەسەر کەوتن. ڕیزێک خزمەتکاری دیوەخان کڕنۆشیان بۆ کرد و ئەو بە بەردەمیاندا تێپەڕی. چووە ژووری چاوەڕوانی. یاوەری نوێی ئیمپراتۆر کە یونیفۆرمی پڕ زریقەوبریقەی لە بەردابوو و سەردووشی و پاگۆنەکانی کۆبەی تازەی تێگیرا بوو، بەڕێزەوە هات بەرەوپیری. دەموچاوی جوان و تیفتیفەدرا بوو. سمێڵی کورت و ڕەش و مووی سەر لاجانگی بە شێوەی ئیمپراتۆر بۆ لای چاوی شانە کرد بوو. شازادە ڤاسیل دۆلگارووکی، جێگری وەزیری بەرگری کە قەڵافەتە ژنانەکەی خەمباری دەنواند و سمێڵ و کاکۆڵی وەک ئیمپاتۆر ڕازاندبۆوە، بە گەرمی بەخێرهاتنی کرد.

چێرنیشۆڤ چاوێکی پڕ پرسیاری لە ژوورەکە کرد و لە یاوەری ئیمپراتۆری پرسی: «خاوەن شکۆ ئیمپراتۆر؟»

یاوەر کە دیار بوو زۆری دەنگی خۆی پێخۆشە، وەڵامی دایەوە: «خاوەن شکۆ هەر ئێستا تەشریفی هێنا.» پاشان هێندە بە ئارامی ڕۆیشت بۆ لای دەرگاکە ئەگەر پەرداخێکی لێوڕێژ لە ئاوت لە سەر سەری دابنایە دڵۆپێکی لێ نەدەڕژا. کە گەیشتە دەرگاکە و چووە ژوورێ سەرتاپای ڕێز و کڕنۆشی لێ دەباری و دیار بوو ئەو شوێنە بە پیرۆزترین شوێنی دنیا دەزانێ. دۆلگارووکی پەروەندەکەی ژێر باخەڵی لێک کردەوە بۆ ئەوەی دڵنیا بێ هەموو بەڵگەنامە پێویستەکانی هێناوە. چێرنیشۆڤ گرژ و بێ تاقەت بە نێو ژوورەکەدا پیاسەی دەکرد بۆ ئەوەی خوێن لە نێو قاچوقولە سڕ و کەسیرە بووەکەیدا وەگەڕیان بکەوێ. لە بیری ئەو ڕاپۆرتەدا بوو کە دەیهەوێ

بە ئیمپراتۆری بدا. یاوەر کە ئێستا زیاتر لە پێشوو ڕێز و حوورمەت لە ڕوخساریدا بەدی دەکرا، کە لە ژوورەکە هاتە دەرێ و چێرنیشۆڤ لە پەنا دەرگاکە ڕاوەستا بوو. یاوەری ئیمپراتۆر بە ئاماژە داوای لە جێگرەکەی وەزیری بەرگری کرد بچێتە ژوورێ.

کۆشکی زستانی دوای سووتمانی ساڵانی ڕابردوو، نۆژەن کرابۆوە، بەڵام نیکۆلا هێشتا کەڵکی لە ژوورەکانی نهۆمی سەروو وەردەگرت، ئەو تەلارەی کە لەوێدا گوێی بۆ ڕاپۆرت و پێشنیاری وەزیر و خاوەن پلەوپایەکان ڕادەگرت، ژوورێکی بەرین بوو بە چوار پەنجەرەی بەرز و گەورەوە. وێنەی گەورەی ئیمپراتۆر ئەلکساندری یەکەم، بە دیوارەکەی ڕووبەڕوودا هەڵواسرا بوو. دوو مێزی نووسین لە نێوان پەنجەرەکاندا داندرا بوون. چەند کورسی لە پاڵ دیوارەکەدا ڕیز کرابوون. مێزێکی نووسینی زۆر گەورە لە نێوەڕاستی ژوورەکەدا بوو. لە پشت مێزەکە کورسیەکی نەرمیان بۆ نیکۆلا دانا بوو، چەند کورسیش لە هەمبەریدا بۆ ئەو کەسانەی بۆ ئیش و کاری دەوڵەتی دەهاتن بۆ لای.

نیکۆلای لە پشت مێزەکە دانیشتبوو. یونیفۆرمی ڕەشی بە قایشی سەر شانەوە و بەبێ سەردووشی، لەبەردابوو. قەڵافەتە زەبەلاحەکەی کە هەوڵی دابوو بە توند کردنی قایشی نێوقەدی زگی چکۆڵە بنوێنێ، بۆ دواوە دەرپەڕیبوو. بە چاوی زەق و بێ تاقەتەوە لە تازە هاتووانی دەڕوانی. ئەو ڕۆژە ڕوخساری کز و ڕەنگ پەڕیوی دەنواند. نێوچاوە پانەکەی کە ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ زیاتر هەڵدەکشا، قژی لاجەسەر و پشتەسەری وەسەرکشا بوو کە دیار بوو زۆر شارەزایانە بۆ پێشەوە شانە کراوە بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەو کڵاو پرچە یەک بکەوێ کە سەر سافەکەی شارد بۆوە. دەموچاوی گرژ و بێ تاقەتتر لە ڕۆژانی ڕابردووی دەنواند. لە ژێر سمێڵە هەڵگەڕاوەکەیدا توند لێوی بە

سـەریەکدا نـابوو، ملیـوانە پـانەکەی کە چەنـاگەی لە سـەری ڕاوەسـتا بـوو، بەو دەموچـاوە گۆشـتن و ڕیشـە تـازە تاشـراوەیەوە، شـەکەتی و نارەزایەتیی پێوە دیار بوو.

بێ تـاقەتییەکەی بە هـۆی مانـدوو بـوونەوە بـوو. شـەوی ڕابـردوو چـوو بـوو بـۆ بالماسـکە. هەر ئەو جـۆرەی کە بـاو بـوو، یۆنیفـۆرمی گــاردی ســواری لە بەر کــرد بــوو کە لە ســەر کڵاوخوودەکەیــان پەیکەرەی چکۆڵەی مەلێک چەقـاوە. ئـاپۆرەی خەڵـکەکەش ترسـەنۆکانە ڕێگایان بۆ قەڵافەتە زلحـۆرت و شـکۆمەندەکەی دەکـردەوە. هەمیسـان تووشــی ئەو ژنە دەمامکــدارە بووبــوو کە لە بالماســکەی پێشــوودا دەمامکەکەی بۆ ئیمپراتۆر لانە برد بوو و لەشولاری جوان و لەبـار و دەنگی نەرم و ڕەنگی سپی و مەڕمەڕیی ژنە بـوو بـووە هـۆی بزوانـی هەوەسـی لە کـار کەوتـووی. ئەو خـانمە لە بالماسـکەی پێشـوودا بەر لەوەی خـۆی ون بکـات بەڵێنـی پێدا بـوو کە لە بالماسـکەی داهـاتوودا چاویان بە یەکتر دەکەوێ.

لە بالماسـکەی دوێنێدا ئەو خـاتوونە خـۆی هـاتبوو بـۆ لای نیکـۆلا. ئەمجارەیـان ئیتـر نەیهیشـتبوو خـۆی بشـارێتەوە. بردبـووی بـۆ لـۆژی تایبەت. دەیویست لەوێ لەگەڵ خـانم بە تەنیـا بێ. کاتێک گەیشـتە بەر دەرگـای لـۆژەکە نیکـۆلا بـۆی دەرکەوت کە پێشـخزمەتی لـۆژەکە لەوێ نییە. نێوچـاوانی تێک نـا، خـۆی دەرگـاکەی کـردەوە و گـوتی خـۆ ئێرە چۆڵ نییە. لۆژەکە خاڵی نەبوو. لە سەر کورسییەکی مەخمەڕی چکۆڵە ئەفسەرێکی سوارە نیزام و کچێکی قژ لـوول بە کەرکەی بالماسـکەوە لەگەڵ ئەفسـەرەکە توند باوەشیان بەیەکدا کرد بوو. کچە دەمـامکەکەی لابردبوو، بە دیتنـی قەڵافەتـی زلحـۆرت و ڕوخسـاری گـرژ و تـووڕەی نیکــۆلا خێــرا دەمــامکەکەی لە ڕوخســاری دایەوە؛ بەڵام ئەفســەری

سواره نیزام لە ترسانا ئەژنۆی شکا و لە جێی خۆی ویشک بوو. سەری داخست و نەیتوانی لە سەر کورسییەکە هەستێ.

نیکۆلا حەزی دەکرد ترس بشکێنێتە دڵی ژێر دەستەکانی. ئەو جۆرە هەیبەت و ترساندنەش بۆ ئەو مایەی شادی و دڵخۆشی بوو. هێندێ جاریش کە خۆر لە لایەکی ترەوە هەڵدەهات و گۆڕانێکی بە سەردا دەهات، لەگەڵ هەمووان بە نەرمی دەجووڵایەوە و بە چەند وشە دڵی کەسە ڕەنجاوەکەی چاک دەکردەوە و خۆشەویستیی خۆی بۆ دەردەبڕی. ئێستا لەو کاتانە بوو. بە ئەفسەرەکەی گوت: «هاوڕێی بەڕێز! تۆ لە من گەنجتری؛ هەر بۆیە ئەدەب و گەورە و چکۆڵەیی وا حوکم دەکات کە تۆ جێگاکەی خۆت بدەی بەمن.» ئەفسەرەکە واقی بردەوە و ڕەنگی هەڵبزرکا. پاشان وەک چەوەندەر سوور هەڵگەڕا. کڕنۆشێکی بۆ برد و خەریک بوو لووتی بگاتەوە ئەژنۆی. لەگەڵ کچە لە لۆژەکە چوونە دەرێ و نیکۆلا و خاتوونیان پێکەوە بەجێ هێشت.

دەرکەوت کە خانم بیستساڵی تەمەنە و کچی دایەنێکی سویدییە. کچە گوتی لە منداڵییەوە کە وێنەکەی نیکۆلای دیتووە شەیدای بووە. هەر بۆیە بڕیاری داوە بە هەر لەونێک بێت سەرنجی ئەو بۆ لای خۆی ڕاکێشێ. ئێستاش بە ئاواتی دڵی خۆی گەیشتبوو و ئیتر هیچ ئارزوویەکی دیکەی نەبوو.

کچەیان برد بۆ کۆشکێک کە نیکۆلا ژنانی دەبردە ئەوێ. نزیکەی کاتژمێرێک لەگەڵ کچە ڕایبوارد. کاتێک گەڕایەوە بۆ ژووری خەوەکەی خۆی. لە سەر چرپایەکی ڕەق و باریک کە شانازیی پێوە دەکرد، خۆی لە گەزدا. کەرکەکەی ـ کە پێی وابوو وەک کڵاوەکەی ناپلیۆن بە ناوبەنگە ـ بە خۆیدا دا. ماوەیەکی زۆری پێچوو تا خەوی لێکەوت. هێندێ جار ڕوخساری ترس تێزاو و هەڵبزرکاوی کچە

سویدییەکەی وەبیر دەهاتەوە. ئەوی بەو شان و ملە سپی و سۆڵ و گۆشـــتنەوە لەگەڵ گـــراوە فەرمیـــیەکەی خـــۆی واتە نێلیـــدۆڤا[٦٥] هەڵدەسـەنگاند. بە خەیاڵیشـیدا نەدەهـات کە تـۆڵازی و داوێنـتەڕی بـۆ پیـاوێکی خـاوەن ژن و مـاڵ ئاکـارێکی نـاحەز و نەشـیاو بـێ. ئەگەر کەسـێکیش ئەوی بەو هـۆیەوە سـەر کـۆنە بکـردایە تووشـی سـەر سـوورمان دەبـوو. سـەرەڕای ئەوەی ئەو کـارەی خـۆی بە هەڵە نەدەزانی، بەڵام هەستێکی تاڵ دڵی ڕێک دەگوشی. بۆ ڕەواندنی ئەو هەسـتە تـاڵەش خـۆی بە فیکـر و خەیـاڵێکەوە سـەرقاڵ دەکـرد کە هەمیشە هێمنایەتیی پێدەبەخشی: ئەویش شکۆ و گەورەیی خۆی بوو و پێی وابوو زۆر مرۆڤێکی مەزن و بێ وێنەیە!

سـەرەڕای ئەوەی شـەوێ زۆر دەرنـگ خەوی لێکەوتبـوو بەر لە سـەعات هەشـت خەبەری بـۆوە. سـەهۆڵی بە جەسـتە گۆشـتن و قەڵەوەکەی خۆیدا هێنا. دۆعـاکەی خوێند. (ئەو وشـە و ڕسـتانەی لە منـداڵییەوە دووپـاتی دەکـردەوە، بـێ ئەوەی یەک وشـە لە ماناکەیـان تێبگـا.) کـڵاو و کەرکەی ئەفسـەریی لە بەر کـرد و لە دەرگـانەی کۆشـکەکە هـاتە دەرێ و ڕۆیشـت بـۆ ڕۆخـی ڕووبـارەکە. لە کەنـاری چۆمەکە تووشـی گەنجێک بوو کە خوێندکاری زانکۆی مـاف و وەک خۆی قەڵەو و زەبەلاح بوو. بە دیتنی یۆنیفۆرمی تـایبەتی ئەو زانکۆیە کە بە ئـازادیخوازی بەناوبانـگ بـوو، نێـو چـاوانی گـرژ کـرد، بەڵام قەڵافەت و هەڵسوکەوتی گەنجەکە و ڕێز و کڕنۆش بردنەکەی کە وای دەنوانـد بە شـێوەی سـەربازی ڕێـزی بـۆدادەنێ، گرێـی نێوچـاوانی پێکردەوە و گوتی:

---

65- Nelidova

«ناوت چییه؟»

«پلۆسۆیۆڤ[66]، خاوەن شکۆ.»

«وادیارە گەنجێکی بە جەرگی!»

کوڕە هەروا بە شێوەی وریا و سڵاوی سەربازی ڕاوەستا بوو.

نیکۆلا لە بەر دەمی ڕاوەستا و گوتی: «حەز دەکەی ببیتە ڕیزی سوپاوە؟»

«نا، خاوەن شکۆ!»

«بێ مێشک...»

نیکۆلا گەڕایەوە و درێژەی بە پیاسەکردنەکەی دا، یەکەم وشە کە بە مێشکیدا هات بە دەنگێکی بەرز دەریبڕی: «کۆپێرڤاین[67]...(ناوی کچە سویدییەکەی دوێنێ بوو). شووورەیی... شووورەیی...» خۆشی نەیدەزانی چی دەڵێ. بەڵام بە بیستنی دەنگی خۆی سەرپۆشی بەسەر هەستەکانیدا دەدا.

دیسان هەستی نارەزایەتی مێشکی داگرتبوو. لە دڵی خۆیدا گوتی: «من نەبم ڕووسیا چیی بە سەردێ؟ نەک هەر ڕووسیا بەڵکوو ئەورووپاش! ئەگەر من نەبووایەم خودا دەزانێ ئەورووپا تووشی چ بارودۆخێک دەبوو!» نەزانی و لاوازیی ئاوەڵزاواکەی خۆی، واتە شای پرۆسی وەبیر هاتەوە. سەری لەقاند. کە گەیشتە بەر دەرگانە چکۆلەکەی کۆشک، چاوی بە گالیسکەکەی خاتوو هێلێنا پاولۆڤنا[68] کەوت لێخوڕێک بە جلوبەرگی فەرمییەوە بەرە و لای دەرگای چوونە ژوورەوەی کۆشک پاڵی پێوە دەنا.

---

66- Polosatov

67- Kopervine

68- Helena Pavlovna

هێلێنـــا پاولۆڤنـــا بە لای ئەوەوە ئـــاخێزگە و ســـەر چـــاوەی ئەو دەستەیە لە خەڵک بوو کە دەیانویست بە وڕێنە و قسەی هەرچی و پەرچـی نەک سـەبارەت بە ئەدەب و زانسـت بەڵکـوو سـەبارەت بە شـێوەی بەڕێـوە بردنـی کۆمەڵگـا و پەیڕەویـی گشـتی حکـوومەتیش بیروڕای خۆیان دەربڕن. ئەو بۆچوونە هەڵەیەش وای لێکردبوون کە پێیان وابوو ئەوان چاکتر لە نیکۆلا دەتوانن کار و باری وڵات بەڕێوە بەرن. بەڵام لەگەڵ ئەوەشـدا دەیزانـی بە هەر شـێوەیەک ئەو جـۆرە مرۆڤـانە تەفروتوونـا بکـات، دیسـان سـەر هەڵـدەدەنەوە. میخاییـل پـاولۆڤیچی[٦٩] بـرای وەبیـر هـاتەوە کە مـاوەیەک لەمەو بەر مـرد بـوو. هەستی بە خەم و تووڕەیی دەکرد. دەموچاوی ڕەش داگەڕا. دیسان دەسـتی پێکـردەوە و ئەوەی بە زەینیـدا دەهـات بە دەنگـی بەرز دەریدەبڕی. کاتێک پێی نایە نێو کۆشکەوە ئینجا بێدەنگ بوو.

کە گەیشتە ژوورەکەی سەرەتا ڕیشی لاجانگ و لاڕوومەت و کڵاو پرچ و میلوانەکەی ڕاستەوپاستە کرد. سمێڵی بۆ لای سەرەوە بادا، لە ئاوێنەکەدا چاوی لە خۆی کرد و ڕۆیشت بۆ وەرگرتنی ڕاپۆرتەکان.

سەرەتا چێرنیشۆڤ چووە ژووریَ. چێرنیشۆڤ بە دیتنی نیکۆلا لە ڕێـوە بـۆی دەرکەوت تـووڕە و بـیَ تـاقەتە. تێـزار بە ساردوسـڕی وەڵامی سڵاوەکەی دایەوە و داوای لێکرد دانیشیَ و بە چاوێکی کز و خەم تێزاوەوە تێی ڕوانی. یەکەم مەسـەلە کە چێرنێشـۆڤ باسـی کـرد گەندەڵیی کۆمیسارییای ئەفسەران بوو کە پەتەیان کەوتبووە سەر ئاو. دوای ئەویش مەسـەلەی جووڵانی هێزەچەکدارەکان بوو لە سنووری پروس. پاشان لیستەی ناوی ئەو ئەفسەرانەی پیَ ڕاگەیاند کە شیاوی

---

69- Pavlovich

بەرز کردنەوەی پلەوپایەن و ناویان لە قەڵەم کەوتووە. لە کۆتاییشدا ڕاپـۆرتەکەی ڤۆرۆنتسـۆڤ سـەبارەت بە حـاجی مـراد و ڕووداوی دڵتەزێنـی ئەو خوێنـدکارەی زانکـۆی پزشـکی بـوو کە ویسـتبووی مامۆستاکەی خۆی بکووژێ.

تێزار گوێی بۆ ڕووداوی گەندەڵییەکە شل کرد بوو، لێوی بە سـەر یەکدا دەگوشی و بە قامکە سپییەکەی (قامکی چوارەمی ئەنگوستیلەی تیـدا بـوو) لە کـاغەزەکەی بەر دەسـتی دەدا. چـاوی لە نێوچـاوانی چێرنیشـۆڤ و فـۆکلەی سـەر تەوێڵـی بڕیبـوو. نێکـوڵا سـوور سـوور دەیزانـی هەمـووان دزی دەکەن. دەیزانـی ئێسـتا دەبـێ ئەفسـەرانی کۆمیساریا سزا بدات. بڕیاری دا چەک و نیشانی هەموویان داماڵێ و بیـانێرێ بـۆ سـەربازخانە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشـدا دەیزانـی ئەو کـارە نابێتە هۆی ئەوەی کەسانی جێگرەوەی ئەوانە دزی نەکەن و دەرووی گەنـدەڵی کـوێر بـکەنەوە. تایبەتمەنـدیی فەرمـانبەری دەوڵەت دزی و گەندەڵی بوو. بەڵام ئەو بە ئەرکی سەرشـانی خـۆی دەزانـی سـزایان بدات و هەوڵـی دەدا لە ئەنجامدانی ئەرکەکانی درێغی نەکات. گوتی: «وادیـارە لە سەرانسـەری ڕووسـیادا تەنیـا کەسـێکی ڕاسـت و پـاک هەیە.»

چێرنیشـۆڤ تێگەیشـت کە نیکـۆلا مەبەسـتی خـۆیەتی. سـەری بە نیشـانەی سـەلماندن لە قانـد و گـوتی: «وادیـارە هەق بە خـاوەن شکۆیە.»

«لێی گەڕێ باوابێ هەتا بڕیار دەدەم.»

کاغەزەکەی وەرگرت و لە لای دەستەچەپی مێزەکە داینا.

دوای ئەوە چێرنیشۆڤ مەسەلەی بەرز کرنەوەی پلەی ئەفسـەران و جـووڵانەوەی سـوپای لە سـنووری پـرۆس هێنـایە گـۆڕێ. نیکـۆلا

چاوی له لیستەکه کرد. هێندێک له ناوەکانی خەت کێشا و به شێوەیەکی کورت و لێبڕاوانه فەرمانی دال لەشکرێک بۆ سنووری پرۆس بنێرن.

نەیدەتوانی له شای پرۆس خۆش بێ که دوای ڕووداوی 1848 لەگەڵ حکوومەتی مەشرووتە یەک کەوتبوو. هەر بۆیه سەرەڕای ئەوەی دۆستانەترین نامەی بۆ ئاوەڵزاواکەی دەنارد، به پێویستی دەزانی هێزەکانی نیشتەجێی ئەو سنووره زیاتر و پەرداختر بکات بۆ ئەوەی له کاتی خۆیدا به کاریان بهێنێ. ئەگەر خەڵکی پرۆس شۆڕشیان بکربایه ئەو هێزانه پێویست بوون، بۆ ئەوەی بتوانی یارمەتیی ئاوەڵزاواکەی بدات. (نیکۆلا هەموو شوێنێکی به شیاوی شۆڕش کردن دەزانی.) هەر وەک هێزی چەکداری بۆ ئەوێ نارد بوو. بوونی ئەو سپایه له سەر سنوور دەبووه هۆی ئەوەی شای پرۆس به شێوەیەکی باش و قورس و قایمتر گوێ بۆ ئامۆژگاری و ڕاێژەکانی ئەو شل بکات. دیسان بیری کردەوە: خودا دەزانێ ئەگەر من نەبووایەم ڕووسیا چیی به سەر دەهات!

«دەی، چیدیکەت پێیه؟»

چێرنیشۆڤ گوتی: «تەتەرێکیش له قەفقازەوە هاتووه» و ڕاپۆرتی خۆبەدەستەوەدانی حاجی مرادی ئاراستەی تێزار کرد که ڤۆرۆنتسۆڤ ناردبووی.

نیکۆلا گوتی: «خەبەری خۆش ئەوەیه! بەڕاستی دەستپێکێکی پیرۆزە!»

چێرنیشۆڤ گوتی: «ڕوون و ئاشکرایه که پلانی خاوەن شکۆ زۆر باش و سەرکەوتووانه بووه.»

نیکۆلا زۆری حەز دەکرد تاریفی مرخ و لێهاتوویيه ستراتیژییەکانی بکەن و به بیستنی ئەو پەسن و تاریفانه شانازیی به خۆیەوه دەکرد. ئەگەر چی له ناخی خۆیدا دەیزانی لەو بوارەدا هیچ مرخ و لێهاتوویەکی نییه، بەڵام بەو تاریفانه دڵخۆش دەبوو و دەگەشایەوه.

له چێرنیشۆڤی پرسی: «مەبەستت چییه؟»

«مەبەستم ئەوەیه ئەگەر پێشتر پلانەکانی خاوەن شکۆیان جێبەجی بکردایه، یانی ئەو پلانەی که به پێی ئەو بڕیار بوو بەره بەره بچنه پێشێ و دارستانەکان له نێو بەرن و سەرچاوەی بژیوی خەڵک کوێر بکەنەوه، ئەگەر ئەو کارەیان بکردایه له مێژ بوو قەفقاز خۆی به دەستەوه دابوو. به بڕوای من حاجی مراد بۆیه خۆی به دەستەوه داوه، بۆی دەرکەوتووه لەوه زیاتر توانایی بەر بەرەکانێی نییه.»

پلانی له نێو بردنی لێرەوارەکان و بڕینی سەرچاوەی بژیوی خەڵک، هی ئێرمیلۆڤ[٧٠] و ویلیاینۆڤ[٧١] بوو. ڕاست به پێچەوانەی پلانی نیکۆلا که دەیویست شوێنی ژیان و مانەوەی شامیل و چەکدارەکانی ژێرەوژوور بکات و خاکی به توورەکه ببێژێ. هەر ئەو پلانەی که ساڵی1845 مەفرەزەیەک بۆ دارگۆ بەڕێ کرا و کوشت و کوشتارێکی زۆریان وەرێ خست. لەگەڵ ئەوانەشدا نیکۆلا خۆی به

70- Ermolov
71- Velyaminov

داڕێژەری پلانی لە نێوبردنی بەرەبەرەی لێڕەوار و فەوتاندنی مەزرا و باخ و کانی و ئاوی خەڵکی قەفقاز دەزانی. دەیگوت باوەڕی کردووە کە خـۆی داڕێـژەری ئەو پـلانەی بڕینـی دارسـتان و فەوتانـدنی سەرچاوەی بژیوی خەڵک بووە، چونکە پێویستی بەوە بوو بۆ ئەوەی ئەو ڕاستییە لە بیر خۆی بەرێتەوە کە بۆچی جێبەجی کردنی پلانی 1845 کە ڕاست بە پێچەوانەی ئەم پلانە بوو و ئەو زۆری پێدا گری لە سـەر کـرد بـوو؟ بەڵام لەگەڵ ئەوەشـدا ئەو پـلانەی دیکەشـی نەدەشاردەوە و شانازیی بە پلانەکەی 1848یشەوە دەکرد ـ هەر ئەو جـۆرەی کە شـانازیی بە پلانـی بـڕین و فەوتانـدنەکەوە دەکـرد ـ لە حاڵێکدا کە هەمووان دەیانزانی ئەو دوو پلانە زۆر جیاواز و تەنانەت زۆریـش دژی یەکـن. تەشیرێسـی و ماسـتاوچێیتی دەوروبەرییەکـانی وەهایـان چەواشـە کـرد بـوو دژوازیـی کـار و کردەوەکـانی خـۆی نەدەدی. هەمـوو ڕاسـتییەکان و بەڵـگە مەنتیقییەکـان و دیـاردە ساکارەکان نەدەبوونە هۆی ئەوەی بە خۆدا بێتەوە و لە ناسـازگارییە وتـاری و ڕەفتـاری و کرداریيەکـانی خـۆی تێبگـات. دڵنیـا بـوو کە فەرمانەکـانی ئەو، هەر چەنـدەش بێ مانـا و زاڵمـانە و دژوازیـش بـن، ئەو پەڕی دادگەری و زانیـاری و تێگەیشـتوویيان پێـوەیە و هەڵـبەت تەنیـا هۆکاریشـی ئەوە بـوو کە ئەم فەرمانـانە ئەو دەریـدەکات. بڕیارەکەشی لە مەڕ ئەو ڕووداوە خوێندکارییەی زانکۆی پزشکییەوە یەکێک لەو بڕیارانە بوو.

مەسـەلەکەش بەو شـێوەیە بـوو کە خوێنـدکارێک دوو جـار لە تاقیکاریدا دەرنەچووبوو؛ بۆ سێهەمین جار لە تاقیکاریدا بەشداریی کردبـوو، بەڵام ئەمجارەشـیان مامۆسـتا قەبـووڵی نەکردبـوو. خوێنـدکارەکە ڕقـی هەسـتا بـوو و بە چەقـۆی قەڵەمتـراش هێرشـی

کردبووه سەر مامۆستا و لە چەند جێوە پووک و پێست بریندار کردبوو.

نیکۆلا پرسیی: «ناوی چی بوو؟»

«بژۆڤسکی[72]»

«پۆلۆنیاییە؟»

«باوباپیرانی پۆلۆنیایی بوون، بەڵام خۆی کاتۆلیکە.»

تێزار نێوچاوانی گرژ کرد. ئەوەندەی توانیبووی پۆلۆنیاییەکانی ئازار دابوو و دەرهەق بە خەڵکی ئەو وڵاتە ستەمی نواندبوو، بۆ پاکانەش بە خۆی سەلماندبوو کە تەواوی پۆلۆنیاییەکان بەدزات و خاپینۆکن. بەو ڕادەیە کە زوڵمی لێکردبوون ڕقی لێیان بوو. چاوی نووقاند، سەری داخست و گوتی: «تۆزێ ڕاوەستە و پەلە مەکە.»

چێرنیشۆڤ کە یەکەم جار نەبوو نێکۆلای لەو حاڵەتەدا دەدی، تێگەیشت کە ئیمپراتۆر دەیهەوێ بڕیارێک بدا و بۆ بڕیاردانەکەش دەبێ بیر و هزری چڕبکاتەوە بۆ ئەوەی باشترین بڕیار، وەک بانگێکی دەروونی پێی ئیلهام بکرێ. بیری دەکردەوە چ فەرمانێک دەربکات کە ڕق و نەفرەتی خۆی لە پۆلۆنیاییەکان پیشان بدات و داخی دڵی خۆی بە ئەوان بڕێژێ. بەم شێوەیە ئیلهامەکەی بۆ هات؛ ڕاپۆرتەکەی هەڵگرت و لە پەراوێزەکەیدا بە خەتێکی درشت و بە لانیکەم سێ هەڵەوە، ئاوای نووسی: «سزای مەرگ بۆ ئەو شیاوە. بەڵام شوکر بۆ خودا سزای لە سێدارەدانمان لابردووە و نامانهەوێ جارێکی تر ئەو یاسایە و سزای مردن جێ بکەوێتەوە. هەزار پیاو هەر کام دوازدە قەمچیی لێدەن بۆ ئەوەی تەممێ بێ.» واژۆیەکی

72- Bzhovski

زۆر گەورەشی لە ژێرەکەی دا. نیکۆلا زۆر باش دەیزانی تامل کردنی دوازدە هەزار زەبری قەمچی، ئەویش بە قەمچیی دەوڵەتی، یانی مەرگی حەتمی لە ژێر ئەشکەنجەدا ـ ستەمێکی لەڕادە بەدەر و بێ هۆ. پێنج هەزار زەبری قەمچی بە هێزترین و پۆڵاییترین پیاو بەرگەی ناگرێ. بەڵام زۆری چێژ لەو ستەمە گەورە و دڵڕەقانەیە وەردەگرت؛ دڵیشی بەوە خۆش بوو کە سزای کوشتنی یاساغ کردووە.

دوای واژۆ کردنی فەرمانەکەی، دایە دەستی چێرنیشۆڤ و گوتی: «فەرموو؛ بیخوێنەوە.»

چێرنیشۆڤ خوێندییەوە و بە نیشانەی سەرسام بوون بەو بڕیارە حەکیمانەیە سەری دانەواند. نیکۆلای گوتیشی: «فەرمان بدەن هەموو خوێندکارانی زانکۆ لە کاتی بەڕێوەبردنی حوکمەکەدا لە گۆڕەپانی ڕێژە ئامادە بن.» لە دڵی خۆیدا بیری کردەوە کە زۆر بە سوود دەبێ بۆیان. «بۆ هەمیشە بیری شۆڕش لە مێشکیان دەردەهاوێم و بنەبڕی دەکەم.»

دەستوور نافەرموون چ وەڵامێک بە ڤۆرۆنتسۆڤ بدەمەوە؟»

«فەرمانی بڕینی دارستان و لە نێوبردنی مەزرا و کێڵگەکان جێبەجێ بکەن. مەهێڵن خۆراک و بژیو بگاتە چێچێنییەکان. هێرش بکەنە سەریان و تەفروتوونایان بکەن.»

چێرنیشۆڤ پرسیی: «ئەی لە مەڕ حاجی مراد چی دەستوور دەفەرموون؟»

«مەگین ڤۆرۆنتسۆڤ نەینووسیوە دەیهەوێ لە قەفقاز کەڵکی لێوەرگرێ و بیکاتە گڕکانی ئاوری براکوژی؟»

چێرنیشۆڤ کە چاوی لە چاوی نیکۆلا نەدەکرد گوتی: «پیتان وانییە ئەوە کارێکی مەترسیدار بێ؟ من بەشبەحاڵی خۆم دەترسم و

زۆریش نیگەرانم؛ شازادە ڤۆرۆنتسۆڤ هێندێ جار کاری مەترسیدار دەکات و بە پارێزەوە هەڵسوکەوت ناکات.»

نیکۆلا کە بۆی دەرکەوتبوو چێرنیشۆڤ دەخوازێ ڕاپۆرتەکەی ڤۆرۆنتسۆڤ بێ کەڵک و خراپ بنوێنێ لێی پرسی: «بیروڕای تۆ چییە؟»

«گەورەم پێیم وایە ئەگەر ئەو بۆ ئاسیای ناوەڕاست دووربخەینەوە کارێکی بەجێیە و تووشی دڵەڕاوکێش نابین.»

نیکۆلای بە تیتاڵ و تەوسەبزەیەکەوە گوتی: «ئەوە بیروڕای جەنابتانە، بەڵام من وا بیر ناکەمەوە. فەرمان بدەن بە پێی ویست و فەرمانی ڤۆرۆنتسۆڤ بجووڵێنەوە.»

چێرنیشۆڤ هەستا سەر پێ و گوتی: «بەڵێ فەرمانتە گەورەم!» دەستی بە سینگییەوە گرت و بە کڕنۆشەوە چووەدەرێ. دۆلگارووکیش دەست لە سەر سینگ و بە کڕنۆشەوە چووە دەرێ. لەو ماوەیەدا تەنیا چەند وشە سەبارەت بە جووڵانەوەی یەکەکان (لە وەڵامی نیکۆلادا) باس کرا.

نیکۆلا دوای ڕۆیشتنی چێرنیشۆڤ، بابیکۆڤ، پارێزگاری ویلایەتیی ڕۆژئاوای بانگ کردە ژوورێ. دوای ڕەزایەت دەربڕین بۆ چالاکییەکانی بابیکۆڤ دژ بەو گوندنیشانەی کە مەزهەبی ئۆرتۆدۆکسیان قەبووڵ نەکردبوو، فەرمانی دا تەواوی لادینەکان بدرێن بە دادگای نیزامی - ماناکەشی ئەوە بوو کە هەموویان بە توندترین شێوە سزا بدرێن. هەر وەها فەرمانی پێدا سەرنووسەری ئەو ڕۆژنامەیەی کە نووسیبووی چەند هەزار وەرزێریان بۆ بێگاری بردووە بۆ مڵکەکانی پاشایەتی، ناچاری بکەن وەک سەرباز لە ئەرتەشدا خزمەت بکات.

نیکۆلا گوتی: «بۆیە ئەو فەرمانانە دەردەکەم چونکە بە پێویستی دەزانم. هەر بۆیە پاشگەز بوونەوە و کەم کردنەوەی نییە.»

بابیکۆڤ ئاگاداری ئەو ستەمە بوو کە لە سەر نەگۆڕینی مەزهەب لە گوندنشینەکان دەکرا. هەر وەها بردنی گوندنشینەکان بۆ کاری زۆرەملی لە ملکەکانی پاشایەتی، بەلام نەدەکرا دژایەتی لەگەڵ فەرمانی ئیمپراتۆر بکات. دژایەتی کردن لەگەڵ ئیمپراتۆر بە مانای لە دەست دانی پلەوپایە بەرزەکەی بوو کە دوای چل ساڵ خزمەت و تێکۆشان لە ڕیزی ئەرتەشدا بە دەستی هێنابوو، ئێستا کەڵکی لێوەردەگرت. هەر بۆیە بە شێوەیەکی مەرایيکارانە سەری دانەواند بۆ ئەوەی نیشان بدات کە فەرمانی زاڵمانە و گەوجانە و ویستی ناپاک و دەسەلاتدارانەی تێزار بەڕێوە دەبات.

دوای بەڕێ کردنی بابیکۆڤ، نیکۆلا وەک کەسێک کە ئەرکی خۆی بە باشترین شێوە ئەنجام دابێ خۆی بادا و ڕۆیشت. پاشان چاوێکی لە کاتژمێرەکەی کرد و چوو خۆی بۆ ڕێوەڕەسمەکە ئامادە بکات. یۆنیفۆرمێکی سەرشانەداری لە بەر کرد و نیشانە و قردێلەکانی بە سینگیدا هەڵواسی. پاشان چوو بۆ تەلاری میوانداری کە زیاتر لە سەد کەس ژن و پیاو - پیاوەکان بە یۆنیفۆرمەوە و ژنەکانیش بە کراسی درێژ و پێسیری ئاوەلاوە - ڕاوەستا بوون و چاوەڕوانی؛ ئەو بوون. کاتێک بە چاوی لێڵ و سینگی دەرپەڕیو و زگی هەڵمەساوەوە گەیشتە تەلارەکە و ئامادە بووانی دی بە چاوی ترس تێزاو و بە شێوەیەکی ڕیابازانەوە چاویان تێبڕیوە، زیاتر لە هەموو کاتێ هەستی بە سەرکەوتن دەکرد. کاتێک چاوی بە کەسێک دەکەوت کە ناوەکەی دەزانی و دەیزانی کێیە، ڕادەوەستا، بە ڕووسی و فەرەنسی هێندێک

لەگەڵی دەدوا و بە چاوێکی ساردوسڕ گوێی بۆ وتە و پرسیارەکانیان ڕادەگرت.

دوای ئەوەی هەمــووان، پیــرۆز باییــان لێکــرد، بەرەو کلیســا وەڕێکەوت. لە شوێنێک کە خواوەند وەک هەموو خەڵکی تر لە زمانی خزمەتکارەکانییەوە ـ قەشـەکان ـ پیرۆزبایی لە نیکۆلا کـرد. لەگەڵ ئەوەی لەو هەمـوو پیرۆزبـایی و پیاهەڵـدانە مانـدوو بووبـوو، چـونکە خـۆی بە شـایانی ئەوە دەزانـی، قەبـووڵی کـرد. دیـارە ئاسـایش و بەختەوەریـی هەمـوو دنیـا بە هـۆی بـوونی ئەوەوە بـوو. هەمـووانیش ئەویـان بە پشـتیوانی خۆیـان دەزانـی! سـەرەڕای ئەوەش کە مانـدوو بووبوو نەیدەتوانی چاوپۆشـی لەو جیهـانە بکـات کە پێویسـتی بە ئەو بوو.

لە کۆتـایی ڕێوەڕەسـمە ئـایینییەکەدا، کە ئوسـقۆف بە جلـوبەرگی شـــکۆدار و ســـەر و ڕووی ڕازاوەوە، لەگەڵ ئـــاوازی شـــکۆمەندی گورووپی کۆمبێژان دەستی کرد بە چڕینی ئاوازی «سـاڵیانی سـاڵ»، نیکۆلا چاوێکی لە دەوروبەری خـۆی کـرد. لە پڕ چـاوی بە نێلیدۆڤا و شـان و مـلە جـوانەکەی کەوت کە لە پـاڵ پەنـجەرەکەدا ڕاوەسـتابوو و دڵنیـا بـوو کە ئەم کـچە لە چـاو کـچەکەی دویشـــەو زۆر جـوانتر و دڵڕفێنترە. دوای بە ئەنجام گەیاندنی ڕێوەڕەسمی ئایینی چـوو بـۆ لای بنەماڵەکەی و چەند خولەکێک لەگەڵ منداڵەکانی بە گاڵتەوگەپ و یاری کــردن ڕایبــوارد. پاشــان لە هێرمیتــاژ[٧٣] تێـپەڕی و چــوو چــاوی بە وەزیـری دەربـار ڤالکۆنسـکی[٧٤] بـکەوێ و هێنـدێک فەرمـان دەربکـات؛ یەکێـک لە فەرمانەکـانی ئەوە بـوو کە لە کـۆی خەرجە تایبەتەکـان،

73- Hermitage
74- Valkonski

مووچەیەکی ساڵانە بۆ دایکی کچەکەی دویشـەو ببڕنەوە. لەویشـەوە وەک هەمیشە ڕۆیشت بۆ سوارکاری.

نانی نیوەڕۆی لە تەلاری پۆمپین خوارد. جگە لە منداڵەکانی نیکۆلا، میخاییـل بـاڵویزی پـرۆس و یـاوەری شـای پرۆسـیش لەوێ بـوون و شانازییان بەو دیدار و هاوڕییەتییەوە دەکرد.

کاتێـک بـارۆن لیـون و بـاڵویزی پـرۆس چـاوەڕوانی ئیمپراتـۆر و شـاژنیان دەکیشـا، سـەبارەت بە هەواڵە ناخۆشـەکان کە لە پۆڵۆنیـاوە دەگەیشتن، وتوویژیکی سەرنجڕاکیش لە نیوانیاندا دەستی پیکرد:

«پۆڵۆنیـا و قەفقـاز دوو برینـی قـووڵن بە جەسـتەی ڕووسـیاوە. لە هەر کام لەو دوو ناوچەیە، لانیکەم سەد هەزار سەرباز پیویستە.»

باڵویزی پرۆس وای نواند کە سەری سووڕماوە و گوتی: «گوتت پۆڵۆنیا؟»

«بەڵێ، ئەوە یەکیک لە شـاکارەکانی میتیرنیخ[75] بـوو کە ئەو دەردە سەرییەی بۆ ئیمە بەجیهیشت.»

لیرەدا بـوو کە شـاژن بە سـەر لەقانـدن و بزەیەکـی سـاردەوە هـاتە ژووری و ئیمپراتـۆر بە دوایـدا. لە کـاتی خـواردنی نـانی نیـوەڕۆدا، ئیمپراتۆر هەواڵی خۆبەدەستەوەدانی حـاجی مـرادی ڕاگەیانـد و گـوتی شـــەڕی قەفقــاز بەم زووانە کۆتــایی پــێ دێ، ئەویــش بە هــۆی ئەو پلانەوە بووە کە بـۆ بڕینـی دارسـتانەکان و لە نیو بردنـی کشـتوکاڵ و بیناکردنی ڕادەیەکی زۆر مۆڵگە و سەربازخانەی چکۆڵە دامرشتووە.

بـاڵویز و یـاوەرەکەی لە بـنەوە چاویکیـان لە یەکتـر کـرد. هەر ئەو ڕۆژە ســـەر لە بەیــانی ســـەبارەت بە لاوازیـــی ڕۆحیـــی نیکـــۆلا و

75- Pompeian

خۆهەڵکێشانی ـ کە خۆی بە پلان دارێژێکی مەزن دەزانی ـ قسەیان کردبوو. باڵوێز بە گەرمی باسی ئەو پلان و چالاکییەی کرد و گوتی دارشتنی ئەو پلانە و جێبەجێ کردنی نیشانەی مدریکی و بلیمەت بوونی پلان دارێژێکی مەزنی وەک نیکۆلایە.

دوای خواردن فراوێن نیکۆلا چوو بۆ بالە. نزیکەی سەد ژنی نیوەڕووت بە کراسی تەنکەوە سەمایان دەکرد. یەکیان سەرنجی نیکۆلای ڕاکێشا. فەرمانی بە بەرپرسی با دا لە لایەن ئەوەوە ئەنگوستیلەیەکی ئەڵماس بدەن بەو خاتوونە.

ڕۆژی دوایی چێرنیشۆڤ بۆ پێشکەش کردنی ڕاپۆرت و بەجێ هێنانی ئەرک و خزمەتی خۆی هات بۆ دیداری تێزار، نیکۆلا دیسان پێداگریی کرد کە چێرنیشۆڤ فەرمانەکانی بە ڤۆرۆنتسۆڤ ڕاگەیێنێ. فەرمانی پێدا ئێستا کە حاجی مراد خۆی بە دەستەوە داوە، زیاتر لە پێشوو بە چالاکی و ئۆپەراسیۆن و جێبەجی کردنی پلانەکانی ئەو تەنگ بە چێچێنییەکان هەڵچنن و بە چۆکیاندا بێنن.

چێرنیشۆڤ ئەو فەرمانانەی بۆ ڤۆرۆنتسۆڤ نووسی و دیسان تەتەرێک دوای گۆڕینی چەندین ئەسپ و ماندوو کردنی عارەبانەچییەکان گەیشتە تفلیس.

## شازدە

بە فەرمانی نیکۆلا، دەستەوبەجێ و لە ڕێکەوتی ژانویەی 1852دا هێرش کرایە سەر چێچێنییەکان. مەفرەزەیەکی پێکهاتوو لە چوار لیوای پیادە و دوو مەفرەزەی کازاخ و هەشت عەرادە تۆپ بەرەو ناوچەکە وەڕێ کەوتن. هێزەکان بە کەناری جادەدا دڕۆیشتنە پێشێ. لە هەر دوو بەری جادەکە دوو ڕیز تیرەندازی مووئەنگێوی جزمە لەپێ و کەڵپۆس لەبەر بە کڵاوی درێژۆکەوە چەک لە شان و بە فیشەکلغی ڕاست و چەپەوە بە سواری و بە پیادە بەرە و شوێنی مەبەست وەڕێکەوتن.

کاتی وەڕێکەوتن، لەو ناوچانەی کە لە ژێر فەرمان و دەسەڵاتی دوژمندا بوون، ئاساییە سەربازەکان هەتا شوێنی مەبەست زمانیان نەدەگەڕا. هێندێ جار تەقوکوتی تایەی عەرادە تۆپێک کە لە جۆگەیەک دەپەڕییەوە و پڕمە و حیلەی ئەسپێک دەهات کە نەیدەزانی فەرمانی بێدەنگی ڕاگەیەندراوە. جاروباریش هاواری تووڕە و تۆسنی فەرماندەرێک دەهاتە گوێ کە دەنگی ژێردەستەکانی دەدا و داوای لێدەکردن سەربازەکان نە زۆر لە یەک دوور کەونەوە و نە زۆریش نزیک ببنەوە بۆ ئەوەی ڕیزەکەیان ڕێکوپێک بێ. تەنیا جارێک بێدەنگییەکە شکا، ئەویش کاتێک بوو کە مامزێکی بەرزگ سپی و پشت خۆڵەمێشین لە نێو چەند دەوەنی توودڕک دەرپەڕی و کارمامزێکی هاوڕەنگی خۆی بەدواوە بوو. ئەو ئاژەڵە جوان و جرپنانە کاتێک خۆیان وێک دەهێنایەوە و بازیان دەدا وەها لە ڕیزی سەربازەکان نزیک دەبوونەوە، سەربازەکانیان خستبووە پێکەنین و

قریوە و بە سەرنێزەوە دەکەوتنە داویان و دەیانویست بیانگرن. بەڵام مامز و بەچکەکەی بە لایەکی دیکەدا تێیانتەقاند و بە نێو ڕیزی تەک تیرەندازەکاندا تێپەڕین. چەند سەربازی سوارە و سەگەکانی گوردان دەم لە سەر پشت وەدوویان کەوتن. بەڵام مامزەکان وەک تێسکەی تفەنگ دەرپەڕین و دوور کەوتنەوە.

هێشتا زستان بوو. نزیک نێوەڕۆ، مەفرەزەکە سێ میل ڕێگایان بڕیبوو. بەیانی زوو وەڕێکەوتبوون. ئێستا خۆر بە تەشقی ئاسمانەوە تیشکی دەباراند و هەمووان جەستەیان گەرم داهاتبوو. پڕشنگی خۆر لە سەرنێزە و ڕووکاری برنجی تۆپهاوێژکانی دەدا و ترووسکە و بریقەیان چاوی ئازار دەدا. مەفرەزەکە لە چۆمێکی ڕووناک و زوڵاڵ تێپەڕیبوو. گەیشتبوونە کێڵگەی شێوکراو و مێرگ و پاوان و شیو و دۆڵی پڕ دار و دەوەن؛ لەولاترەوە گردێکی ڕازاوی بە دار و بنچک داپۆشرابوو و ڕەش دەچۆوە، لەولای ئەویشەوە شاخ و لووتک سپی و بەفرپۆشەکان وەک ئەڵماس لە ژێر پڕشنگی خۆردا دەدرەوشانەوە.

ئەفسەرێکی بالابەرز و قەڵافەت ڕێکوپێک بەناوی بووتلێر[76]، بە کەرکەیەکی ڕەش و کڵاوێکی درێژۆکەوە بووبووە پێشەنگی مەفرەزەی پێنجەم و تفەنگەکەی نابووە سەرشانی. ناخی لێوڕێژ بوو لە هەستی شیرینی ژیان و ترسی مەرگ و حەزی شەڕ و تێکهەڵچوون. هەستی دەکرد بەشێک لەو سروشتە بەرین و بەربڵاوەیە و وزەیەکی تاک و نادیار هەڵیدەسووڕێنێ دووهەم جار بوو کە لە ئۆپەراسیۆندا بەشداریی دەکرد. نەک هیچ باکێکی لە گوللە و تەقە و ویزە نەبوو، بەڵکوو سەری هەڵدێنا و بە ڕوویەکی خۆش و

76- Butler

دەم بە پێکەنینەوە چاوی لە هاوکاران و سەربازەکانی دەکرد و بە دەنگێکی هێدی و نەرم سەبارەت بە مەسەلەی جۆرا و جۆر دەدوا.

ڕیزی سەربازەکان لە جادەی سەرەکی کلابوون و چوونە سەر ڕێگایەکی باریک و خاکی کە بە نێو کێڵگەیەکی گەنمەشامیدا تێدەپەڕی. خەریک بوون لە دارستانەکە نزیک ببنەوە ویزەی شوومی گوللەیەک هات و مەعلووم نەبوو لە کام لاوە تەقەیان کردووە و گوللەکە بە ویزەویز بە نێوان عارەبانەی تفاق و کەلوپەلەکانیاندا تێپەڕی و لە قەراغ ڕێگاکە لە زەوی درا.

بووتلێر بە بزەیەکەوە ڕووی لە هاوڕێکەی کرد کە لەگەڵیدا پیاسەی دەکرد و گوتی: «دەستی پێکرد.»

هەرواش بوو. دوای ویزەی گوللەکە، دەستەیەک سواری چێچێنی ئاڵا بە دەست لە ژێر سێبەری دارەکان هاتنە دەرێ. لە نێو پۆلی سوارەکاندا، ئاڵایەکی سەوزی گەورە وەبەر چاو دەکەوت. ملازمێکی خاوەن ئەزموون و چاوتیژ هات بۆ لای بووتلێری زلکوێر و گوتی پیموایە دەبێ شامیل خۆی لەوێ بێ. سوارە چێچێنییەکان لە گردەکە هاتنە خوارێ و لە لای دەستە ڕاستی ڕێگاکە و لە بەرزترین شوێنی زاڵ بە سەر مەفرەزەکەدا جێگیر بوون. ژێنڕاڵێکی وردیلە بە کەرکەیەکی ڕەش و کڵاوێکی درێژۆکەوە و بە سواری ئەسپێک، بە وێرغە کردن هاتە پێشێ و لە دەستەکەی بووتلێر نزیک بۆوە و فەرمانی پێدان بەرەو لای ڕاست بڕۆنە پێشێ و لەگەڵ ئەو سوارانە بەرە و ڕووبن کە دەهاتنە خوارێ. بووتلێر بە خێرایی هێزەکانی بەرەو ئەو لایە برد کە فەرمانی پێدرابوو، بەڵام بەر لەوەی بگاتە دۆڵەکە لە پشت سەرییەوە گرمەی دوو گوللە تۆپ هات. ئاوڕی دایەوە. دوو باقە دووکەڵی خۆڵەمێشین لە لوولەی دوو تۆپهاوێژەکە

دەهاتە دەرێ و وەک هەور سەر دۆڵەکەی تەنی. سوارانی چیانشین، کە وێدەچوو چاوەڕوانی ئەوە نەبووە لەگەڵ تۆپ هاوێژ بەرەو ڕووبن، پاشەکشێیان کرد. هێزەکانی بووتلێر تەقەیان لێکردن. بۆنی باڕووت هەموو دۆڵەکەی داگرتبوو. چیانشینەکان بە پەلە پاشەکشێیان کرد و بە قوونەشەڕ لە دۆڵێکی تر تێپەڕین و گەیشتنە گردێکی دیکە. هێزەکانی بووتلێر چیانشینەکانیان ڕەتاند و لە دۆڵێکی تردا گەیشتنە گوندێک.

بووتلێر و سەربازەکانی و بە دوای کازاخەکاندا چوونە نێو گوندەکە و دیتیان چۆڵوهۆڵە. فەرمانیان بە سەربازەکان دا مەزرا و گیشە و ماڵەکان ئاور تێبەردەن. بۆنی دووکەڵ و بۆکڕووز ئاسمانی گوندەکەی تەنی. لە نێو ئەو چڕەدووکەڵەدا سەربازەکان لە ماڵ و کۆڵانان وەربوون. ئەوەی دۆزییانەوە هێنایانە دەرێ. بەر لە هەموو شتێک ئەو مریشک و کەڵەشێرانەیان بە گوللە پێکا کە گوندنشینەکان فریا نەکەوتبوون لەگەڵ خۆیان بیانبەن. ئەفسەرەکان دوور لە گوندە ئاور تێبەدراوەکە دانیشتن و دەستیان کرد بە خواردن و خواردنەوە. ملازمێک لە سەر تەختە دارێک شانەیەک هەنگوینی بۆ هێنان. چێچێنییەکان لە هیچ کوێ دیار نەبوون. فەرمانی گەڕانەوە ڕاگەیەندرا. سەربازەکان لە دەرەوەی گوندەکە ڕیزیان بەست. بووتلێر یەکێک لەو ئەفسەرانە بوو کە دوابەدوای هێزەکان دەڕۆیشت. لەگەڵ وەڕێکەوتنیان چێچێنییەکان پەیدا بوون. وەدووی سەربازەکان کەوتن و تەقەیان لێ دەکردن. بەڵام کە گەیشتنە دەشتایی دەستیان لە شوێن گرتن و تەقە کردن هەڵدەگرت.

دوای تێپەڕین لەو چۆمەی کە بەیانی لێی پەڕیبوونەوە، سەربازەکان بە مێرگ و مەزراکاندا بڵاو بوونەوە و گۆرانیبێژانی هەر

دوو دەستەکە هاتنە پێشێ و دەستیان کرد بە خوێندنی سروود و گۆرانی.

سەربازەکان سروودیان دەچڕی. ئەسپەکەی بووتلێر بە هەوای سروودەکە هەنگاوی هەڵدێنایەوە. ترێزۆرکا[77]، سەگە کولکنەکەی سەربازخانە، لە پێشەوە هەڵدەهات و کلکی لە سەر پشتی قانگڵە کردبوو. دەتگوت ئەویش وەک فەرماندەر بەرپرسایەتیی هێزەکانی لە ئەستۆیە. بووتلێر بە نەشە و کەیف ساز و ئارام بوو. ئەو پێی وابوو شەڕ یانی چوون بەرەوپیری مەترسی و گیان لە دەست دان؛ مەرگێک کە دەبووە هۆی پاداش و ڕێزی هاوقەتارەکانی لێرە و لە ڕووسیا. ئەوەش جێی سەر سووڕمان بوو کە لە خەیاڵی ئەودا هیچ کات لایەنەکانی دیکەی شەڕ خۆیان نەدەنواند؛ یانی ئەو گرینگیی بە کوژران و برینداربوونی سەرباز و ئەفسەرەکانی و چیانشینەکان نەدەدا. بۆ ئەوەی خەیاڵی شاعیرانە و ناڕاستەقیینەی خۆی بۆ جەنگ لە دەست نەدات، بێ ئیختیار خۆی لە بینینی کوژراو و بریندارەکان دەدزییەوە. ئەو ڕۆژە سێ کەس کوژرا بوون و دوازدە کەسیش بریندار بوو بوون. بەڵام کاتێک بە لایاندا تێپەڕین بووتلێر ڕووی وەرگێڕا و نەیویست چاوی پێیان بکەوێ. نە ڕاوەستا و نەچاوی لە تەرمەکان کرد. تەنیا باروودۆخی سەیر و مۆم شکڵی دەستی کوژراوێکی دیتبوو کە پەڵە خوێنێکی ڕەشی پێوە مەیيبوو.

عەمید پێی گوت: «هاوڕێی بەڕێز! ژیانی ئێرە لەگەڵ پترزبۆرگ جیاوازە. لەوێ تەنیا مەشق و بەڕاست و بەچەپ و وریابن هەیە، بەڵام لێرە خوێن و مەرگ و گولله هەیە. ئێمەش ئەرکی خۆمان بە

---

77- Trezorka

جیٚ هێناوه و ئێستا دهگهڕێینهوه بۆ ماڵێ. ماشا کهیکمان بۆ دێنیٚ و پاشان ئاشی خۆش و بهتامی کهلهرم لهبهر دهممان دادهنیٚ. بهوه دهڵێن ژیان!» دوای ئهوه لهگهڵ سروودی سهربازهکان هاودهنگ بوو.

با سریوهی نهدههات. ههوا هێنده تازه و ساف و ساماڵ بوو، گرد و کێوه بهفر گرتووهکان له دوورهوه به جوانی دهبیندران. لهگهڵ دهنگی سروودی سهربازهکان خرمهی پۆستاڵ و تهقوکوتی تۆپهاوێژهکان دههات و لهو دۆڵهدا ئاوێته دهبوون. سروودێک که له دهستهکهی بووتلێردا دهیانچڕی یهکێک له خوێندکارانی زانکۆی ئهفسهران ئاوازهکهی دانا بوو و به ههوایهکی شاد و تایبهتی سهما، کۆتاییی پێدههات.

بووتلێر لهگهڵ عهمید پترۆڤ، ههنگاوی دهنا که ئهفسهرێکی له خۆی پله بهرزتر بوو و پێکهوه له ماڵێکدا دهژیان. پێی وابوو ناتوانیٚ شوکرانهبژێر بیٚ که له گاردی سهڵتهنهتی هاتۆته دهریٚ و چۆته ڕیزی سوپای شهڕگهی قهفقازهوه. هۆی سهرهکیی گۆڕینی شوێنی خزمهتهکهشی ئهوه بوو ههرچی ههیبوو له قوماردا دۆڕاند بووی. دهترسا نهتوانیٚ واز له قومار بێنیٚ و ئیتر هیچیشی نهبوو بیدۆڕێنیٚ. ئێستا بارودۆخهکه به تهواوی گۆڕا بوو و چێژی لهم جۆره ژیانه پڕ ئازایهتی و بهجهرگانهیه وهردهگرت و ههستی به بهختهوهری دهکرد. له بیری نهمابوو مایهپووچ بووه و ئهفسهرانی بوێر و ڕۆحسووک و ههمیشه مهست و عهمید پترۆڤ خۆی، هێنده شیرین و له دڵهوه نزیکیان دهنواند که هێندیٚ جار پێی وابوو ئهم ههموو خۆشییه دهبیٚ خهون و خهیاڵ بیٚ و ئهو هێشتا له پترزبۆرگه و له ژووری پڕ له دووکهڵی جگهرهدا چاوی له پهڕهکان بڕیوه و خهریکی قومار کردنه و ڕقی ڕهقیبهکهی، دڵی داگرتووه و به هۆی ژانهسهرێکی قورسهوه

سەری پێچاوە. باوەڕی نەدەکرد لە ناوچەیەکی پڕشکۆی قەفقازە و لەگەڵ هاوسەنگەر و هاوقەتارە بەجەرگەکانی دانیشتووە.

عەمید لەگەڵ کچی خرمەتکارێکی سەربازخانە، کە پێشتر ناوی ماشا بوو و ئێستا ناوێکی خانەدانانەی لە خۆی نابوو و بە ماریا دیمیتری یۆڤنا بانگیان دەکرد، وەک ژن و مێرد پێکەوە دەژیان. ماریا ژنێکی کەزیە زێڕین و خوێن شیرین و شۆخوشەنگ بوو، زگی نەدەکرد. سی ساڵی تەمەن بوو. ڕابردووی هەر چۆنێک بوو، ئێستا هاوڕێی وەفاداری عەمید بوو، وەک پەرستارێکی دڵسۆزیش خزمەتی دەکرد «هەڵبەت عەمیدیش پێویستی بە پەرستارێکی دڵسۆز هەبوو، چونکە زۆربەی کات مەشرووبی دەخواردەوە و هێندە سەرخۆش دەبوو هۆش و ئیختیاری لانەدەما.

کاتێک گەیشتنە سەربازەخانە هەموو شتێک بەو شێوەیە بوو کە عەمید پێشبینیی کردبوو. ماریا دمتیری یۆڤنا[78] شێوێکی خۆش و بەتامی بۆ ئەو و بووتلێر و دوو ئەفسەری تر لێنابوو کە بانگهێشتن کرابوون. عەمید هێندەی خوارد و خواردەوە ئیتر نەیدەتوانی قسە بکات. هەر بۆیە هەستا و ڕۆیشت بۆ ژوورەکەی خۆی.

بووتلێریش زیاتر لە حەدی خۆی خواردبوویەوە. کاتێک چوو بۆ ژوورەکەی خۆی هەستی بە شەکەتییەکی خۆش و چێژبەخش کرد. بە بێ تاقەتییەوە جلەکانی داکەند و لە سەر قەرەوێڵەکەی خۆی ڕاکێشا و خەوێکی قورس و شیرین دایگرت.

---

78- Marya Dmitrievna

## حەڤدە

گوندە خاپوور کراوەکە، ئەو گوندە بوو کە حاجی مراد شەوی پێش خۆبەدەستەوەدانەکەی لەوێ مابۆوە. سادۆ و بنەماڵەکەی پێش ئەوەی هێزەکانی ڕووس بگەنە گوندەکە هەڵاتبوون و خۆیان دەرباز کرد بوو. کاتێک گەڕایەوە دیتی ماڵەکەیان ڕووخاندووە، سەربانی ماڵەکەی لە بەریەک هەڵوەشاوە و دەرگا و پەنجەرە و دەستەک و ئالۆداری میچی خانووەکەی هەمووی سووتێندراوە و بۆتە خۆڵەمێش. حەوشەکەی پڕ بووە لە پیسی و زبڵوزاڵ. تەرمی کوڕەکەی، ئەو گەنجە چاوڕەش و جوانچاکەکەی بە دیتنی حاجی مراد گەشا بۆوە و ترووسکەی شادی دەموچاوی داگرتبوو، لە سەر ئەسپێک بوو و بە مەفرەشبار بەرەو مزگەوت دەیانهێنا. لە پشتەوە بە سەرنێزە لێیاندابوو و کوشتبوویان. ژنێکی مەند و لە سەرەخۆ کە ئەو شەوە میوانداریی لە حاجی مراد و ئیلدار کردبوو، لە ژوورسەری تەرمی کوڕەکەی دانیشتبوو. قژی ئاڵۆزا بوو و هێندەی دەموچاوی خۆی ڕنیبوو خوین بە چەنە و ڕوومەتییەوە وشک بوو بۆوە. دەگریا و فرمێسکی هەڵدەوەراند. سادۆ دەستی دابووە قوڵینگ و پێمەڕە و لەگەڵ خزمەکانی چووبوو قەبر بۆ کوڕەکەی هەڵکەنێ. باوکە پیرەکەی سادۆش پاڵی بە دیوارە ڕووخاوەکەوە دابوو بە چەقۆ

چیلکەیەکی دەتاشی و بە سەرسامییەوە چاوی لە ڕووبەڕووی خۆی بڕیبوو. تازە لە شوێنی پلوورە هەنگەکانی گەڕابۆوە. دوو خۆیان کا و گــزرەی هەبــوو، ئەویشــیان ئــاور تێبەردابــوو. داری قەیســی و بەلاڵووکەکانشی کە خۆی چەقاندبوونی و تازە هاتبوونە بەر، شکاند بوویـانن و ئاوریـان تێبەردابـوون. لەوەش خراپتـر هەمـوو پلـوورە هەنگەکانیان بە هەنگوین و مێشەکانەوە سووتاند بوو. زیڕەی منداڵ و گریـان و هـاواری دایکـان و بارەبـاری مەڕ و بەرخ لە برسـانا، ئـاوێتە بووبـوون و لەو گونـدە سـووتاو و خـاپوورەدا دەنگیـان دەدایەوە. ئەو منـدالانەی فامیـان کـرد بـۆوە بە چـاوی تـرس تێـزاو و دڵـی پـڕ و بەکـوڵەوە لە گەورەکانیـان دەڕوانـی. دیـار بـوو ئـاوی کانیاوەکەیـان ڕمووده کردووه بۆ ئەوەی کەڵکی لێ وەرنەگیرێ. مزگەوتەکەشیان پـیس کردبـوو و مەلا و مجیـور خەریکـی خـاوێن کـردنەوەی بـوون. هەستی چێچێنییەکان، بە گەنج و پیرەوە، لپاولپ لە ڕق و نەفرەتێکی زۆر بــوو. ئەو ڕق و نەفــرەتە بە شــێوەیەک بــوو کە نەتــدەزانی چ نـاوێکی لـێ بنێـی، چـونکە ئەوان ئەو ڕووسـییە گلاوانەیـان بە مـرۆڤ نەدەزانی کە ڕقییان لێیان بێ. ئەو هەسـتەی بە هـۆی زوڵـم و سـتەمی ئەو دڕنـدە مـرۆڤ ئاسـایانەوە ناخیـانی داگرتبـوو، هێنـدە بەلایـانەوە قێزەون و دزێو بوو، دڵی ڕێک دەگوشین و وەک ویست و ئارەزووی لە نێـو بردنـی مشـک و کاکڵەمێشـان و گـورگ بەلایـانەوە سروشـتیی دەنواند ـ چەشنی غەریزەی ژیان.

گوندنشــینەکان، تەنیــا دوو ڕێگایــان لە بەر بــوو: یــان لە گونــد بمێنـــــنەوە و ئەوەی لە مـــــاوەی ژیانیانـــــدا بە کـــــاری بەردەوام و تاقەتپڕووکێن سازیان کردبوو و ئـاوا بـێ بەزەییانە خـاپوور کرابـوو، سـەر لە نـوێ دروسـت بکەنەوە و بیـر لەوە نەکەنەوە کە دیسـان ئەو

بەڵایەیان بە سەر دێتەوە. یان بە پێچەوانەی دین و ئیمانیان، کارێک بکەن کە زۆر بەلایانەوە ناخۆش و قێزەوەن بێت، یانی خۆیان تەسلیمی ڕووسەکان بکەن. کەیخودا و ڕیش سپییەکان کۆڕێکیان پێکهێنا، نوێژیان کرد و پاشان چەند نوێنەریان نارد بۆ لای شامیل تابێت بە هانایانەوە. دوای ئەوەش دەست بە کار بوون تا گوندە کاول کراوەکەیان سەر لە نوێ نۆژەن و ئاوەدان بکەنەوە.

## هەژدە

ڕۆژی دوایــی، ســەر لە بەیــانی، بــووتلێر لە دەرگــای دواوەی مـاڵەکەی هـاتە دەرێ. دەیویست بەر لە خواردنی ناشتا ـ کە هەمیشـە لەگەڵ پترۆڤ دەیخوارد ـ پیاسەیەک بکات و هەوایەکی تـازە هەڵمـژێ. خۆر تـازە لە پشـت کێوە بەرزەکـان هـاتبووە دەرێ و تیرێـژەکەی لە دیوارە سپییەکانی دەستە ڕاستی دابوو و چاوی وەشـەوارە دەخست. بەڵام وەک هەمیشـە چـاولێکردنی گـردە پڕ دار و دەوەنەکـانی دەسـتە چەپ و هێڵی لێڵی لووتکە بە بەفر داپۆشـراوەکان وەک هەور دەچـون و دڵگر و هێمنایەتی بەخش بوون.

بـووتلێر چـاوی لە کێوەکـان کـرد و هەناسـەیەکی قـووڵی هەڵکێشـا. دڵخـۆش بـوو کە زینـدووە و لە شـوێنێکی ئـاوا جـوان و دڵگـر دەژی. بیـری لە هەواڵەکـانی ڕۆژی ڕابـردووی دەکـردەوە و تێکهەڵچـوون و پاشەکشـێ کــردنەکەی بە دڵ بــوو و هەســتی بە ڕەزایەت دەکــرد. وەبیـری هـاتەوە ماریـا چەنـدە بە مێهرەبـانییەوە لەگەڵیـان بەرەوڕوو بووبــوو و بەتــایبەت ڕێزێکــی زۆری بــۆ ئەو دانــابوو و بە دیتنــی گەشـابۆوە. پەلکە و کەزیە زێـڕینەکەی ماریا دیمیتری یۆڤنا بەو بزە شیرین و پڕشـنگ هـاوێژەوە و بە دەموچـاوی سـپی و ناسـک و سـەر کـوڵمەی تـۆزێ شـڵەوە، بـێ ئیختیـار سـەرنجی بـووتلێری گەنـج و دڵــتەڕی ڕاکێشــابوو. هێنــدێ جــار پێــی وابــوو ماریــا دڵــی بــۆی

دەکـورکێنی، بەڵام نەیدەویسـت خیـانەت بە هـاوڕێ ڕۆحسـووک و دڵپـاکەکەی خـۆی بکـات. لەوەی کە ڕێـزی بـۆ ئەو ژنە دادەنـا و نەیدەهێشـت دڵـی گەرد بگـرێ، هەسـتی بە ڕەزایەت و سـەربەرزی دەکرد.

سەرقاڵی ئەو جۆرە خەیاڵ و بیرۆکانە بوو کە خرمەی سمی چەند ئەسپ لە ڕێگا خاکییەکەی ڕووبەڕوویەوە هات و هەودای خەیاڵەکانی لێئاڵۆزاند. چەند سوار لەو لایەوە دەهاتن. دوو سوار چاک لە پێش دەستەیەک کازاخەوە دەهاتن. یەکیان چەرکەسییەکی سپیی لەبەردا و مێزەرێکـی گەورەی بە سـەرەوە بـوو. ئەوی دیکەشـیان ئەفسـەرێکی ڕووسی بوو: ڕەشتاڵە و لووت قەڵەنگی و چەند نیشانەی زیوینی بە سینگەوە بوو. پیاوە مێزەر بە سەرەکەش سواری ئەسپە شێیەکی جوان بووبوو. یاڵ و کلکی ئەسپەکە کاڵتر بوو، سەری چکۆڵە و چاوەکانیشی گەش و پڕ تروسکە بوون. ئەفسەری ڕووسی سواری ئەسپێکی گەورە و خۆشڕەو بووبوو. بووتلێر کە ئاشقی ئەسپ بوو لەڕێوە هێز و توانایی و ڕەسەن بوونی ئەسپی یەکەمی بۆ دەرکەوت و ڕاوەستا بۆ ئەوەی بزانێ ئەو سوارانە کێن.

ئەفسـەرەکە لێـی پرسـی: «ئەمە مـاڵی ئەفسـەری فەرمانـدەیە؟» بە زاراوەکەیدا دیار بوو بە ڕەچەڵەک بیانییە.

بووتلێر لەوەڵامیدا گوتی: «بەڵێ، ماڵی ئەفسەری فەرماندەیە». لە ئەفسەرەکە چووە پێشێ و بە ئاماژە لێی پرسی ئەو کابرا مێزەر بە سەرە کێیە؟

«ئەوە حـاجی مـرادە. هـاتووە لە لای ئەفسـەری فەرمانـدە بمێنێتەوە.»

بووتلێر ئاگاداری خۆبەدەستەوەدانەکەی حاجی مراد بوو، بەڵام چاوەڕوانی ئەوە نەبوو لێرە و لەم سەربازخانە بچووکە چاوی پێی بکەوێ. حاجی مراد بە چاوێکی دۆستانەوە تەماشای بووتلێری کرد.

بووتلێر بە زمانی تاتاری گوتی: «خوش گێلدی!»

حاجی مراد سەری لەقاند و گوتی: «ساغ ئۆل». پاشان ئەسپەکەی بۆ لای بووتلێر ڕادا. دەستی ڕاداشت و خەرەزەنەکەی بە دوو قامکیدا شۆڕ بووبۆوە، لێی پرسی: «سەرۆک؟»

بووتلێر وەڵامی دایەوە: «نا. سەرۆک لەوێیە، ئێستا دەچم بانگی دەکەم.»

بە قاڵدرمەکاندا وەسەر کەوت و دەرگاکەی کردەوە، بەڵام ئەو دەرگایەی کە ماریا دیمتیری یۆڤنا دەرگای میوانانی پێدەگوت، داخرابوو. تەنانەت دوای ئەوەی چەند جاری لە دەرگاکە دا، هیچ کەس نەهات بیکاتەوە. دیسان لە دەرگاکەی دا، کە دیتی ناکرێتەوە، لە دەرگای دواوە چووە ژووریّ. بانگی خزمەتکارەکەی کرد بەڵام ئەویش وەڵامی نەدایەوە. کاتێک هیچ کام لە خزمەتکارەکانی بە دەنگییەوە نەهاتن، ڕۆیشت بۆ چێشتخانەکە. ماریا بە دەموچاوی سوورهەڵگەڕاو و لەچکە بە سەر و قۆڵی هەڵکراوەوە باسکە سپی و ناسکەکەی وەدەرخستبوو و خەریکی هەویر شێلان بوو بۆ شیرینی. هەویرەکە لە ڕەنگی باسکی بوو.

بووتلێر لێی پرسی: «خزمەتکارەکان لە کوێن؟»

«چوون بۆ شەراب خواردنەوە. چکارێکت پێیانە؟»

«بێن دەرگای پێشەوە بکەنەوە. پۆلێک خەڵک لە کوێستانەوە هاتوون و لە بەر دەرگای دەرەوە چاوەڕوانن. حاجی مراد هاتووە.

ماریا دیمیتری یۆڤنا بە پێکەنینەوە گوتی: «ئەمەش یەکێکی تر لە درۆکانتە؟ چلدرۆ!»

«نا، گاڵتە ناکەم. لە بەر هەیوانەکە ڕاوەستاوە.»

«بەڕاستیتە؟»

«ئەی خۆ درۆ ناکەم. بڕۆ خۆت چاو لێکە».

ماریا دیمیتری یۆڤنا قۆڵی دادایەوە. دەستێکی بە سەر و قژیدا هێنا بۆ ئەوەی دڵنیا بێ دەرزیلە و قردێلەکان ڕێکوپێکن یان نا و گوتی: «کەوایە واباشترە بچم ئیڤان ماتڤێڤیچ لە خەو هەستێنم.»

«نا خۆم دەچم.»

خزمەتکارەکە بەپەلە هاتە ژووریٚ و بە بووتلێر گوت: «باندارنکۆڤ بڕۆ زوو دەرگاکە بکەوە.»

ماریا دیمیتری یۆڤنا گوتی: «ئەوە باشترە» دیسان چوو بە لای هەویرەکەیەوە و دەستی کرد بە گونتک گرتن.

عەمید ئیڤان ماتڤێڤیچ کە ئاگادار کرا حاجی مراد هاتووە بۆ ماڵەکەی، چونکە زانیبووی گەیشتۆتە گرۆزنیا، بەو هەواڵە تووشی سەرسوورمان نەبوو.

لە سەر قەرەوێڵەکەی دانیشت. جگەرەیەکی داگیرساند. بە دەنگی بەرز گەرووی ساف کرد و لەوەی کە کار بە دەستانی باڵا ئەو دەردەسەرییەیان بە تووشەوە کردووە، دەستی کرد بە پرتەوبۆڵە و لە بەر خۆیەوە قسەی دەکرد.

کە خۆی ئامادە کرد بچێت بۆ لای میوانەکانی، داوای لە خزمەتکارەکەی کرد «دەوا»ی بۆ بێنیٚ. خزمەتکارەکەی دەیزانی مەبەستی لە دەوا «ڤۆدکا»یە. لەڕێوە چوو هێنای.

عەمید لەگەڵ ئەوەی ڤۆدکاکەکەی نا بەسەریەوە گوتی: «هیچ شتێک لە مەشرووبی تێکەڵ خراپتر نییە. دۆینێ چۆرێکم خواردەوە، ئێستاش سەرم ژان دەکا.» هەستا و چوو بۆ ژووری میوانداری. بووتلێر حاجی مراد و ئەفسەرەکەی هاوڕێی بردبوو بۆ ئەوێ.

ئەفسەر، فەرمانەکانی فەرماندەی باڵی چەپی پێ ڕاگەیاند. فەرمانەکەش ئەوە بوو کە ڕێز لە حاجی مراد بگرێ و بە گەرمی میوانداریی لێ بکات، هەروەها بوارێک بڕەخسێنێ و بە هۆی سیخوڕەکانەوە پێوەندی بە بنەماڵەکەی حاجی مرادەوە بگرێ، بەڵام هیچ کات ڕێگە نەدات حاجی مراد بەبێ تاقمێک کازاخی چاوەدێر بۆ شوێنێک بچێت.

عەمید دوای خوێندنەوەی فەرمانەکان چاوێکی لە سەرتاپای حاجی مراد کرد و دیسان سەرنجی کاغەزەکەی دایەوە. دوای چەند جار دووپات کردنەوەی ئەو کارە چاوی لە حاجی مراد بڕی و گوتی: «یاخچی، بەیگ، یاخچی (باشە، قوربان باشە.) با لێرە بمێنێتەوە. بەڵام پێی بڵێن من ڕێگەم پێ نەداوە بهێڵم بە تەنیا بەمڵاوە و بەو لادا بڕوات و دەبێ گوێڕایەڵی فەرمانەکان بم. باشە بووتلێر، تۆ پێت وایە کوێ بۆ نیشتەجێ کردنی ئەو شیاوە؟ نووسینگەکەت پێ چۆنە؟»

بووتلێر دەرفەتی وەڵام دانەوەی نەبوو. ماریا دیمیتری یۆڤنا کە لە چێشتخانەکەوە هاتبوو و لە پاڵ دەرگاکەدا ڕاوەستا بوو گوتی: «هەر ئێرە باشە. ژووری میوان و ئەمبارەکە بۆ نیشتەجێ بوونی دادەنێین. چونکە ئێرە بەر چاوترە و هەمیشە چاویان بە سەریەوە دەبێ.»

بووتلێر گوتی: من قسەکەی ماریا دیمیتری یۆڤنام بە دڵە و زۆر فیکرێکی باشە.»

عەمید نێوچاوانی گرژ کرد و گوتی: «ژنەکە تۆ خۆ لەو کارانە هەڵمەقوتێنە. ژنان نابێ خۆ لە هەموو کاروبارێک وەردەن.»

لەو ماوەیەدا کە سەرقاڵی دەمەتەقێ بوون، حاجی مراد دەستی لە سەر مشتووی خەنجەرەکەی دانابوو، بزەیەکیشی لە سەر لێوبوو. بەبێ تاقەتییەوە مات و بێدەنگ دانیشتبوو. گوتی: بۆ ئەو گرینگ نییە لە کوێ نیشتەجێ دەبێ. هیچ شتێکی نەدەویست جگە لەو شتانەی سەردار ڕێگەی پێدابوو، یانی پێوەندی لەگەڵ چیانیشنان. کەوایە دەیویست بە ئاسانی و بەبێ کۆسپ و تەگەرە بتوانن چاویان پێی بکەوێ.

عەمید گوتی هەروا دەبێ. داوای لە بووتلێر کرد تا ژوورەکان ئامادە دەکەن و خواردنی ساز دەبێ، میوانەکان سەر گەرم بکات. خۆشی چوو بۆ نووسینگەکەی و دەستی کرد بە ئامادە کردنی ڕاپۆرتی پێویست و دەرکردنی فەرمانی تایبەتی.

تەکلیفی پێوەندی حاجی مراد لەگەڵ ناسیاوە نوێیەکانی هەر لەڕێوە ڕوون بۆوە. هەر لە سەرەتاوە عەمیدی نەکەوتە بەر دڵ. لووتبەرزانە هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکرد و ڕقی لێی بوو. زۆری ماریا دیمتیری یۆڤنا خۆشدەویست، جوانی و ساکارییەکەی کە وەک ژنانی بیانی دەچوو، سەرنجی ڕاکێشا بوو. کەوتبووە ژێر کاریگەریی ئەو ژنە خوێن شیرینەوە و بێ ئیختیار دڵی بۆ جوانییەکەی لێیدەدا و بۆ لای ڕادەکێشرا. هەوڵی دەدا چاوی لێنەکات و تەنانەت لەگەڵیشیدا نەدوێ، بەڵام بێ ئیختیار چاوی بۆ لای دەفڕی و ڕەوت و ڕۆیینی دەخستە ژێر چاوەدێری.

لەیەکەم کاتی ئاشناییەوە بووتلێری کەوتە بەر دڵ. زۆر زووش پێکەوە بوونە هاوڕێ. بە تامەزۆرییەوە قسەی لەگەڵ دەکرد و چێژی

له وته‌کـانی وه‌رده‌گـرت. سـه‌باره‌ت به ژیـانی پرسـیاری لێـده‌کرد. ده‌رده‌دڵه‌کـانی خـۆی بـۆ بـاس ده‌کـرد. ئه‌و هه‌واڵانه‌ی سـیخوڕه‌کان بۆیـان ده‌هێنـا له‌گه‌ڵ ئه‌و ده‌یهێنـایه گـوڕێ و ته‌نـانه‌ت ته‌گبیـر و ڕاوێژیشـی پێـده‌کرد و داوای لێـده‌کرد پێـی بڵـێ چـۆن هه‌ڵسـوکه‌وت بکات.

هه‌واڵی سیخوڕه‌کان باش نه‌بوون. له چوار ڕۆژی سه‌ره‌تادا که له سـه‌ربازخانه بـوو، دووجـار هـاتن بـۆ چـاوپێکه‌وتنی و هه‌ر دوو جاره‌که‌ش هه‌واڵی ناخۆش و دڵ تاسێنیان پێدا.

## نۆزده

دوای چوونی حاجی مراد بۆ نێو ڕووسەکان، چەکدارەکانی شامیل بنەماڵەکەیان دەستبەسەر کرد و بردیانن بۆ ڤێرێنۆ[79] هەتا شامیل بێت و بڕیار بدات چییان لێبکەن. ژنەکان یانی دایکی و دوو ژنەکەی لە ماڵی یەکێک لە سەر کردەکانی هێزی شامیل کە ناوی ئیبراهیم ڕەشید بوو، بەند کرابوون. یۆسفی کوڕی حاجی مراد کە لاوێکی هەژدە ساڵان بوو، لە سیاچاڵێکدا کە حەوت پا قووڵ بوو لەگەڵ حەوت کەس جینایەتکار زیندانی کرابوو. چاوەڕوان بوون شامیل لە شەڕی ڕووسەکان بگەڕێتەوە و بڕیار بدات چی لێ بکەن.

شامیل ڕۆژی شەشەمی ژانوییە دوای شەڕ و پێکدادانێکی قورس لەگەڵ ڕووسەکان، گەڕایەوە بۆ ڤێدێنۆ. بە قسەی ڕووسەکان شامیل لەو شەڕەدا شکستی هێنا بوو،، زۆر بە زەحمەت توانیبووی پاشەکشێ بکات و خۆی بگەیێنێتەوە ڤێدێنۆ. بەڵام بە قسەی شامیل و چەکدارەکانی لەو شەڕەدا زۆر بوێرانە لەگەڵ ڕووسەکان تێکهەڵچووبوون و توانیبوویان هێزەکانی ڕووس تەفروتوونا بکەن. لەو شەڕەدا شامیل خۆشی تەقەی کردبوو، کارێک کە هیچ کات نەیدەکرد و تەنیا فەرمانی بە هێزەکانی دەدا و خۆی تەقە لە تفەنگییەوە نەدەهات. شمشێرەکەی لە کالان دەرکێشا بوو و

79- Vedeno

ویسـتبووی هەڵکـوتێتە سـەر ڕووسـەکان. بەڵام مریـدەکانی نەیانهێشتبوو. دوو کەس لە مریدەکانی هەر لەڕێوە کوژرابوون.

نزیـک نێـوەڕۆ شـامیل و هێزەکـانی گەیشـتنەوە گونـدی ڤێـدێنۆ، مریدەکانی دەوریان گرتبوو و بۆ خۆنواندن تەقەیان دەکرد.

تەواوی دانیشـتووانی ئەو گونـدە گەورەیە بە ورد و درشـتەوە ڕژابـوونە کـۆڵان، یـان چووبـوونە سـەربان بـۆ ئەوەی فەرمانـدەرە لێهاتووەکەی خۆیان ببینن. بۆ ڕێزگرتنی ئەو بە تفەنگ و شەشـە ئاگر تەقەیان دەکرد. شامیل سواری ئەسپێکی سپی بووبوو. ئەسپەکە هەتا لە مـاڵێ نزیکتـر دەبـۆوە زیـاتر گوشـاری بـۆ لەغـاوەکەی دەهێنـا و دەتگوت گازی لێدەگرێ. زین و ڕەختی ئەسپەکە سڵسڵە و پلپڵەی زێو و ئـاڵتوونی پێـوە نەبـوو و زۆر سـاکار بـوو. نێوەڕاسـتی قایشـی هەوسـارەکەی بە وردەکـارییەوە تەنزیلێکـی سـووری پێوە قـایم کـرا بوو.ڕکێفەکـانی وەک قـاپی کـانزا دەچـوون.لە ژێـر زینەکەیـدا لـۆیەکی شـاڵێکی سـوور بە دەرکەوتبـوو. ئیمـام کەرکەیەکـی قـاوەیی لە بەر دابوو، دەوری ملیوانە و سەرقۆڵەکانی بە کۆبەیەکی تیسکن ڕازابۆوە، پشـتێنێکی ڕەشـی لە نێو قەدە بـاریکەکەی بەسـتبوو و خەنجەرێکی لە بەر پشـتێنەی چەقانـدبوو. کڵاوێکـی ڕەشـی لە سـەر نـابوو نـووکەکەی تـۆزێ خـوار بووبـۆوە و گـوڵینگێکی ڕەشـی پێـوە هەڵواسـرابوو. مێزەرێکـی لە دەوری کـڵاوەکەی هاڵانـدبوو و لکەیەکـی بەردابـۆوە. چەکمەی قایشـی تۆخی لە پێدا و پووزەوانە ڕەشـەکانی قردێلەیەکی ڕەش و باریکی پێدا درووابوو. هیچ شتێکی بە نرخ وەک زێڕ و زێوی بە خۆیـدا نەکردبـوو. لەشـولاری لە بـار و کەڵەگەت و بەهێـزی بەو جلوبەرگە سـاکار و بەبـێ سڵسـڵە و پلـپڵانەوە لە نێو مریدەکانیدا کە هەموویـان زێـڕ و زەمبەریـان بە جلـوبەرگ و چەک و ڕەختەکانیانـدا

هەڵواسیبوو، ئەو شوێنەی لەسەر خەڵکی دانابوو کە خۆی دەیویست و دەیزانــی کــاریگەریی باشــی لە ســەریان هەیە. دەموچــاوی ڕەنــگ بزرکــاوی بەو ڕدێــنە تاشــراوەوە دەتگــوت وشــک بــووە و چــاوە چکۆڵەکـانی و نێوچـاوانە گـرژەکەی هێنـدە سـارد و بـێ جـووڵە بـوو دەتگوت پەیکەریەکی بەردینە و لەو شوێنە چەقیوە.

بنەماڵەی حاجی مراد وەک خەڵکی تر هـاتبوونە بەر هەیـوانەکە و سـەیری هـاتنی ئیمامیـان دەکـرد. تەنیـا پاتیمـات[80] دایکـی حـاجی مـراد نەهــاتبووە دەرێ و بە پرچــی ســپییەوە لە نێــو ژوورەکەدا لە ســەر عەرزی مـات و دڵتەنـگ بە قۆڵە درێژ و کزەکانی، لاقە ڕەقەڵەکانی لە بـاوەش گرتبـوو، چـاوەڕەش و بـێ سـۆماکەی لە سـەلکەبزووتی نێـو کۆماجەکە بڕیبوو. وەک کوڕەکەی دڵی لیوڕێژ بوو لە ڕق و نەفرەتـی شــامیل. ئێســتاش زیــاتر لە هەمــوو کاتێــک ڕقــی ئەوی لە ناخیــدا کۆکردبـۆوە و چـاوی لە هـاتنی سـەر کەوتـووانەی شـامیل نەبـوو. لە سـیاچاڵێکی تاریـک و بۆگەنـدا گـوێی لە گـۆرانی و تەقەی شـادی بـوو، ئەشـکەنجەیەکی تامـڵ دەکـرد کە هەمـوو گەنجێکـی وریـا و بـزۆز و بێبەش لە ئـازادی هەسـتی پێدەکا. تەنیـا هاوبەنـدە داماوەکـانی خـۆی دەدی لە ژێـر گوشـاری ئەشـکەنجە و تـۆق و زەنجیـردا دەیانناڵانـد و بەو حاڵەشــەوە لە یەکتــر بێــزار بــوون. لە نــاخی دڵەوە ئێرەییــان بەو کەسانە دەبرد کە لە هەوای ئازاد و ڕووناکدا بە شادی و دڵخۆشیەوە سواری ئەسپی خۆشبەز بوون و بە نێو کۆڵانەکانی گوندا خەریکی جلیتێن و تەڕاتێن و هەوهەون.

---

80- Patimat

شامیل بە گۆڕەپانی گوندەکەدا تێپەڕی و خۆی کرد بە حەوشەی بەرینی قەڵادا. دوو چەکداری لەزگی دەروازەی حەوشەکەیان کردەوە کە ئاپۆرەی خەڵک لەوێدا شەپۆلی دەدا. تاقمێک لە ڕێگای دوورەوە هاتبوون بۆ ئەوەی ویست و داخوازێی خۆیانی پێ بڵێن. دەستەیەک هاتبوون بۆ سکاڵا و داوای دادپەروەرییان دەکرد. چەند کەسیش شامیل خۆی فەرمانی دابوو بیانهێنن بۆ سزدان و محاکەمە کردن. کاتێک ئیمام هاتە ژووری، هەمووان دەستیان لە سەر سینگیان دانا و بەڕێزەوە کڕنۆشیان بۆ برد و سڵاویان کرد. تاقمێکیش چۆکیان دادا و هەتا لە حەوشەی دەرەوە تێپەڕی و چووە حەوشەی ژوورەوە هەر بەو شێوەیە مانەوە. سەرەڕای ئەوەی لە نێو ئەو خەڵکەدا کەسانێکی دەدی کە حەزی بە چارەیان نەدەکرد، بەڵام ئەو کەسانەش کەم نەبوون کە داخوازی و سکاڵایان هەبوو و چاوەڕوانی دادپەروەریی ئەو بوون؛ هەر بۆیە بەو حاڵەتە سارد و بەردینەیەی خۆی مایەوە هەتا خۆی کرد بە حەوشەی ژووروودا. لەبەر دەرگانەی دیوەخانەکەی لە ئەسپەکەی دابەزی. بە هۆی گوشاری شەڕ و تێکهەڵچوونەکەوە ڕۆح و جەستەی شەکەت بووبوو. چونکە سەرەڕای ڕاگەیاندنی سەرکەوتن، دەیزانی شەڕ و پێکدادانەکە سەر کەوتووانە نەبووە و چەندین گوندی چێچێنییەکان کاول بوون و لە ئاگردا سووتاون. دەیزانی چێچێنییە ڕاڕایی و حولحولییەکان لێی دڵسارد بوونەتەوە و لەوانەیە ئەوانەی لە نزیک سنوور دەژین پشتی تێکەن و بچنە پاڵ ڕووسەکانەوە.

ئەوانە هەمووی لە سەر دڵی قورساییان دەکرد و دڵ و هەستیان ڕێک دەگوشی. لەو کاتەدا نەیدەویست بیر لەو شتانە بکاتەوە. تەنیا یەک شتی دەویست: پشوودان و چێژوەرگرتن لە ژیانی ژن و

مێردایەتی و لە ئامێز گرتنی ژنە جوان و شۆخوشەنگەکەی، ئامینەی هەژدەساڵان و ڕەوەک، کە لەو کاتەدا دەتگوت کامامزی سلۆکە چەند هەنگاو لەو لاترەوە لەگەڵ ژنان لە پشت لاجامەکانەوە دەیڕوانی. شامیل دەیزانی ئەویش لەگەڵ ژنەکان لە نێوان کەلێنی لاجامەکانەوە چاوی تێبڕیوە. بەڵام لەو کاتەدا نەک نەیدەتوانی بچێت بۆ لای ژنە ناسک و نازدارەکەی بەڵکوو نەیدەتوانی دانیشێ و بۆ تاوێک پاڵ بداتەوە و شەکەتی لە لەشی دەرچێ. دەبوو نوێژی نیوەڕۆ بکات بەڵام تاقەتی نەبوو، لە لایەکیشەوە وەک پێشەوای ئایینی نەیدەتوانی چاوپۆشی لە نوێژەکەی بکات و جگە لەوەش خۆی وەک نانی شەوێ بە پێویستی دەزانی و پێی وابوو ئەرکێکی واجب و ئاسمانییە و پشت گوێ خستنی تاوانێکی گەورەیە. هەر بۆیە دەسنوێژی گرت و ئەو کەسانەی چاوەڕوانی بوون بانگی کردن.

یەکەم کەس کە هات جەمالەدین خەزوور و مامۆستای بوو؛ پیرەپیاوێکی جوانچاک، ڕیشی دەتگوت چۆڕی شیرە و سەر کوڵمەکانی سوور و خوێن تێزاو بوون. دۆعایەکی خوێند و سەبارەت بە تێکهەڵچوونەکە پرسیاری لە شامیل کرد، ئەو ڕووداوانەشی بۆ گێڕایەوە کە لە کاتی نەبوونی ئەودا لە گوندەکە ڕوویان دابوو.

لە میانەی ئەو هەموو ڕووداوە جۆراوجۆرانەدا و لەوانە کوشتن و کێشە و خوێنخوازی و دزینی مەڕوماڵات و خراپەکاری، کەسانێک تۆمەتبار بوون کە بە پێچەوانەی یاسای بنەڕەتی جووڵابوونەوە و پەنایان بۆ کێشانی مادەی سڕ کەر و مەشرووباتی ئەڵکۆلی بردبوو. هەروەها جەمالەدین بەوردی باسی کرد کە حاجی مراد چۆن کەسانێکی ناردووە ئەندامانی خێزانەکەی بەرن بۆ لای ڕووسەکان. بەڵام لەوە ئاگادار بوون و بنەماڵەکەیان دەستبەسەر کردووە و

هێناویانه بۆ ڤێدێنۆ تا ئیمام بڕیار بدات چۆنیان هەڵسوکەوت لەگەڵ بکرێ. کەیخودا و ڕیش سپییەکان لە ژوورێکی تەنیشت گۆڕەپانەکە کۆ بووبوونەوە و سەبارەت بەو مەسەلانە خەریکی ئاخافتن بوون. جەماڵەدین داوای کرد چونکە سێ ڕۆژە چاوەڕوانی ئەون واباشترە هەر ئێستا کاروبارەکانی ئەوان یەکلایی بکاتەوە بۆ ئەوەی دڵنیابن و بچنەوە سەر کار و ژیانی خۆیان.

زیدات ژنەگەورەکەی خواردنی بۆ هێنا، ژنێکی ڕەشتاڵەی دەمولووت باریک و ڕەقەڵە بوو، شامیل خۆشی نەدەویست بەڵام ڕێز لێنانی ئەوی بە پێویست دەزانی. شامیل نانی خوارد. پاشان چوو بۆ ژووری میوانداری. شەش کەیخودا کە ئەندامانی شۆڕای گوندەکە بوون و ڕیشیان سپی و ماش و برنجی یان سوور بوو، کڵاوی قووچ یان مێزەریان لەسەرنابوو. هەموویان بەشمیت و چەرکەسیی نوێیان لەبەرکردبوو، خەنجەریان لە بەر پشتینەیان هەڵچەقاندبوو. لەگەڵ وەژوور کەوتنی شامیل هەموویان قرچەپێ هەستان و سەری ڕێزیان بۆ دانەواند. شامیل لە هەموویان کەڵەگەتتر بوو. کە هاتە ژوورێ، هەموویان دەستیان هەڵبڕی و چاویان قووچاند و دەستیان کرد بە دۆعا خوێندن، پاشان هەر دوو دەستیان بە دەموچاویاندا هێنا. دوای ئەوە دانیشتن. ئیمام لە سەرووی هەموویانەوە دانیشت، پاڵی دایەوە و دەستیان کرد بە ڕاوێژ و هێنانە گوڕی مەسەلە و کێشەکان.

بە پێی یاسا و شەرع بڕیاریان لە سەر جینایەتکارەکان دا. دوو کەس کە دزییان کرد بوو حوکمی پەڕاندنی دەستیان بۆ دەرکرا. بڕیار بوو پیاوێک کە کەسێکی کوشتبوو سەری بپەڕێنن. سێ کەسیش فحێل بوون و حوکمی بەخشینیان بۆ دەرکرا. پاشان چوونە سەر

باسی سەرەکی: چبکەن کە چێچێنییەکان نەچنە پاڵ ڕووسەکانەوە.
جەماڵەدین پێشنیاری کرد ئەم ئاگادارییەی ژێرەوە بڵاو بکرێتەوە:

«خەڵکی بەشەرەفی چێچێن؛ ڕەحمەتی خوداتان لێ بێ. وەک بیستوومانە ڕووسەکان ئامێزیان بۆ گرتوونەوە و داواتان لێدەکەن بچنە پاڵیان و لە ڕیزەکانی ئەواندا خەبات بکەن. باوەڕیان پێ مەکەن. خۆتان بەدەستەوە مەدەن. ئازا و بەجەرگ بن و دژوارییەکان تامڵ بکەن. ئەگەر لەم دنیایەش پاداش وەرنەگرن خودا لەو دنیا لێتان خۆش دەبێ و پاداشتان دەداتەوە. خۆ لە بیرتان ماوە لە ڕابردوودا چەکتان دانا و خۆتان بە دەستەوەدا ئەو ئەو ڕووسە شەڕەنگێزانە چ بەڵایەکیان بە سەرتان هێنا. ئەگەر ساڵی 1848 خودا ئەقڵی پێ نەدایەن و ڕێگای ڕاستی نەخستایەتە بەرپێتان ئێستا سەربازی ئەوان بوون و بە جێی خەنجەری خۆتان، سەرنێزەی ئەوانتان بە نێوقەدتاندا هەڵدەواسی و چەکی ئەوانتان لە شان دەکرد و ژنەکانتان بێ دەرپێ و لاقوقول ڕووت و بێ ئابڕوو بوون.

عیبرەت لە ڕابردوو وەرگرن. واباشترە نەیاری ڕووسەکان بن و لە ڕێگای بەرگری کردن لە خاک و ناموسی خۆتاندا شەهید بن نەک بچنە ڕیزی کافرەکانەوە. هێندێک سەبر بگرن هەتا بە شمشێر و قورئانەوە دێم و ڕێبەریتان دەکەم و بە دژی نەیاران ڕادەپەرین. بەڵام ئێستا فەرمانتان پێدەدەم کە بیری خۆبەدەستەوەدان و تەسلیم بوون لە سەرتان دەرکەن متمانە بەو ڕووسە دڕندانە مەکەن.»

شامیل ئاگادارییەکەی پەسند و ئیمزا کرد و ناردی بڵاوی بکەنەوە. دوای کۆتایی پێهێنانی ئەو بابەتە چوونە سەر مەسەلەی حاجی مراد کە بە لای شامیلەوە زۆر گرنیگ بوو؛ ئەگەر چی نەیدەویست بە ئاشکرا دانی پێدا بنێ. بەڵام دەیزانی ئەگەر حاجی مراد بەو لێزانی و

ئازایەتی و لێبوردووییەوە لەگەڵ ئەو بووایە، ئێستا ئەو دوو پۆیی و سارد بوونەوەیە لە نێو چێچێنییەکاندا سەری هەڵنەدەدا. ئەو بەرژەوەندیی کار و بزووتنەوەکەی لە سازان و ئاشتبوونەوە لەگەڵ حاجی مراددا دەدی و دەیویست دیسان کەڵک لە خزمەت و ئازایەتییەکەی وەرگرێ. بەڵام چونکە ئەو سازان و یەکگرتنە نەدەلوا، نەیدەویست ڕووسەکانیش کەڵک لەو ئازایەتی و تایبەتمەندییانەی حاجی مراد وەرگرن. هەر بۆیە پێوست بوو هەڵیخەڵەتینێ بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە و سەری بە گۆمدا بکات. بۆ گەیشتن بەو ئامانجە یان دەبوو کەسێک بنێرێ بۆ تفلیس و لەوێ بێکووژێ یان بە زمانلووسی هەڵیفریوێنێ و وای لێبکات بە پێی خۆی بێت بۆ قوربانگاکەی. ڕێگای گەیشتن بەو ئامانجەش، کەڵک وەرگرتن لە بنەماڵەکەی و بەتایبەت کوڕەکەی بوو کە شامیل دەیزانی حاجی مراد ڕۆح و گیانی لەگەڵیەتی؛ هەر بۆیە بڕیاری دا لەو ڕێگایەوە بۆی بچێت.

دوای کۆتایی هاتنی ئەو باسانە لە لایەن ئەندامانی ئەنجومەنەوە، شامیل چاوی قووچاند و بێدەنگ بوو. ئەندامانی ئەنجومەن دەیانزانی ئەو کارەی شامیل مراقیب مان و گوێ شل کردنە بۆ فەرمایشتەکانی پێغەمبەر کە فەرمانی پێدەدا چیبکات و چۆن بۆ ئەو کارە پیرۆزە هەنگاو هەڵگرێ.

دوای پێنج خولەک بێدەنگی، بە شێوەیەکی هێدی و بە قورساخی و ویقارەوە، چاوی هەڵێنا، زیاتر لە کاتی ئاسایی خۆی تووڕە کرد و گوتی: «کوڕەکەی حاجی مراد بێنن.»

جەماڵەدین گوتی: «قوربان لێرەیە.»

یۆسف کوڕە لاواز و ڕەنگ بزرکاو و جڵ شڕەکەی حاجی مراد، ئەگەرچی بۆگەنی لێدەهات، بەڵام دەموچاو و قەلافەتی جوان و دڵگر

بوو. چاوە ڕەشەکانی وەک چاوی پاتیماتی دایەگەورەی ترووسکەی دەهات. لە پاڵ دەرگای حەوشەکەدا ڕاوەستا بوو بۆ ئەوەی بانگی بکەن.

هەستی یۆسفیش دەرهەق بە شامیل کتومت وەک باوکی وابوو. نەیدەزانی لە ڕابردوودا چی ڕوویداوە. ئەگەر بیشیزانیبایە چونکە بە چاوی خۆی نەیدەیبوو و هەستی پێنەکردبوو، نەیدەتوانی تێبگا بۆچی باوکی ئاوا داخی شامیلی لە دڵدایە و بە خوێنی سەری توونییە. بۆ ئەو تەنیا ئارەزووی ژیان، ئاسوودەیی و ڕابواردن بوو، دەیویست وەک کوڕی نایب ژیانێکی خۆش و بەختەوەرانەی هەبێ و خەڵکی خوونزاخ ڕێزی بۆ دانێن، دوژمنایەتی لەگەڵ شامیل و دارودەستەکەشی بە لای ئەوەوە کارێکی هەڵە و بێ مانا بوو. بەتایبەت بە هۆی سەر بزیۆی و دژایەتی کردنی باوکی لەگەڵ شامیل، لە ناخەوە ئاکار و کردەوەکانی شامیلی بەلاوە پەسند بوو و بە چاوی ڕێزەوە لێی دەڕوانی و کارەکانی باوکی بە هەڵە دەزانی. ئەویش وەک چیانشینەکانی تر ئاشق و شەیدای شامیل بوو و ئەوی بەپێشەوا و ڕێبەری ڕۆحیی خۆی دەزانی. بە هەستێکی تایبەت و دڵەدواییەکی ئاوێتەی ڕێز و خۆشەویستییەوە پێی نایە ژووری میوانداری. کە چووە ژووری شامیل نێوچاوی گرژ کرد و چاوی لە چاوی بڕی. یۆسف گتێکی گرت. پاشان ڕۆیشت بۆی لای شامیل و دەستی سپی و درێژۆکەی شامیلی ماچ کرد.

«تۆ کوڕی حاجی مرادی؟»

«بەڵێ ئیمام.»

«دەزانی باوکت چیی کردووە؟»

«دەزانم ئیمام؛ من خۆم بە شەرمەزار دەزانم.»

«نووسین دەزانی؟»

«دەرسی فەقێیەتیم خوێندووە.»

شامیل گوتی: «کەوایە نامەیەک بۆ باوکت بنووسە و پێی بڵێ ئەگەر پێش بایرام[81] بگەڕێتەوە بۆ لای من لێی خۆش دەبم و وەک ڕابردوو چاوی لێدەکەم و دڵم لێی پاک دەبێتەوە. بەڵام ئەگەر نەگەڕێتەوە و لە ڕیزی ڕووسەکاندا بمێنێتەوە ـ لێرەدا شامیل نێو چاوی تێک نا ـ دایەگەورەت و دایکت دەنێرم بۆ گوندێکی تر و سەری تۆش دەپەڕێنم.»

یۆسف لە چاوی شامیل بڕی و بەبێ ئەوەی چاوبترووکێنێ، بە نیشانەی تێگەیشتن سەری کڕنۆشی بۆ شامیل دانەواند.

«ئەوە بنووسە با بیدەم بە تەتەرەکە بیگەیێنێ.»

شامیل بێدەنگ بوو؛ ماوەیەک بە بێدەنگی چاوی لە یۆسف بڕی.

«ئەوە بنووسە. باڵی بەزەییت وەسەردەکێشم و سەرت ناپەڕێنم بەڵام وەک هەموو ناپاک و خەیانەتکارەکان هەر دوو چاوت دەردەهێنم.

یۆسف لە بەر دەمی شامیل هێمنایەتیی خۆی پاراست، بەڵام کاتێک هاتە دەرێ هۆمەنی بۆ پاسەوانەکەی هاوڕێی برد و خەنجەرەکەی لە بەر پشتێنەی دەرکێشا و ویستی بیکات بە زگی خۆیدا، بەڵام دەستەوبەجێ هەڵیانکوتایە سەری و دەست و لاقیان بەست و خستیانە سیاچاڵەوە.

---

٨١- بایرام: جەژن

عەسر بەر لە نوێژی شێوان، شامیل کەرکە کەلبەدوون کراو و میلوانە تیسکنەکەی دا بە شانیدا و ڕۆیشت بۆ ئەو دیوی شیشبەندەکان، ئەو شوێنەی ژنەکانی لێی نیشتەجێ بوون. ڕاست ڕۆیشت بۆ ژوورەکەی ئامینە. لەوێ نەبوو. شامیل چونکە نەیدەویست هیچکەس ببینێ، لە پشت دەرگاکە خۆی حەشاردا و چاوەڕوان مایەوە. بەڵام ئامینە لێی زویر بووبوو؛ چونکە پارچەی هەورێشمینی بۆ زێدات هێنا بوو بەڵام هیچی بە ئەو نەدابوو. چاوی لێبوو شامیل چووە ژوورەکەی، بەڵام بە ئانقەست نەچوو بۆ لای؛ ماوەیەک لە ژوورەکەی زێدات ڕاوەستا و چاوی لە قەڵافەتی سپی پۆشی شامیل بڕی دەچووە ژوورێ و دەهاتەوە دەرێ، لە دڵی خۆیدا پێی پێکەنی.

شامیل دوای ئەوەی ماوەیەک چاوەڕوانی کێشا و بۆی دەرکەوت چاوەڕوانییەکەی بێهوودەیە، گەڕایەوە بۆ ژوورەکەی خۆی. ئیتر هەوا تاریک داهاتبوو و کاتی نوێژی خەوتنان بوو.

## بیست

حاجی مراد ماوەی حەوتوویەک لە قەڵا میوانی عەمید بوو. ماریا دیمیتری یۆڤنا لەگەڵ خەنیفە دەمقڕەیان لێ پەیدا بووبوو (حاجی مراد تەنیا دوو کەس لە هاوڕێکانی ـ خەنیفە و ئیلدار ـ ی لەگەڵ خۆی هێنا بـــوو) و لە چێشـــتخانەکە دەریکـــرد بـــوو، دیـــار بـــوو ڕێـــز و خۆشەویســـتییەکی تـــایبەتی بـــۆ حـــاجی مـــراد هەیە. هەر بـــۆیە لە دەرفەتێک دەگەڕا لە تەنیاییدا چاوی پێی بکەوێ و خزمەتێکی پێ بکات. زۆری حەز دەکرد گوێی لە باس و بەسەرهاتی بنەماڵەکەی حاجی مراد بێ. دەیزانی چەند ژن و چەند منداڵی هەیە و هەر کام چەند ساڵیان تەمەنە. هەموو جارێک کە سیخوڕەکان دەهاتن، هەتا ئەو جێیەی لە توانایدا بوو، هەوڵی دەدا لە ئاکامی دانووستانەکان ئاگادار بێ و بزانێ بە کوێ گەیشتووە.

لەو ماوەیەدا بووتلێریش بە تەواوی لەگەڵ حاجی مراد بووبووە هاوڕێ و خۆمانە هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکرد. هێندێ جار حاجی مراد دەچوو بۆ ژوورەکەی و جاروباریش ئەو دەهات بۆ لای حاجی مراد. زۆر جار بە یارمەتیی دیلمانج پێکەوە دەدوان، بڕێ جاریش ـ هەتا ئەو جێـــیەی لە توانایـــدا هەبووـــ بە ئامـــاژە و بـــزە و زەردەخەنە تێیدەگەیاند و خۆشەویستیی خۆی بۆ دەردەبڕی. بە هەڵسوکەوتی ئیلداردا دیار بوو حاجی مراد بووتلێری کەوتۆتە بەر دڵ. کاتێک

بــووتلێر دەچــووە ژوورەکەی حــاجی مــراد ئیلــدار دەگەشــایەوە، بە بزەیەکی شیرین ددانە سپییەکانی بە دیار دەکەوت و بە گەرموگوڕی پێشوازیی لێدەکرد. خێرا پاڵەوپشتەکەی بۆ ڕاستە و پاستە دەکرد بۆ ئەوەی پاڵی پێوەدا و شمشێرەکەی لێوەردەگرت.

بــووتلێر لەگەڵ خەنــیفەی تیســکن، بــرای شــیریی حــاجی مــرادیش نێوانی خــۆش بــوو. خەنــیفە زۆربەی ئــاواز و گــۆرانیی چیانشــینەکانی دەزانــی، بە دەنگێکــی خــۆش دەیچــڕی و بــووتلێر کەیفــی پێــدەکرد. جاروبار حاجی مراد داوای لە خەنیفە دەکرد گۆرانی بڵێ و فەرمانی پێدەدا چ گۆرانییەک بچڕێ. خەنیفە دەنگێکی گڕی هەبوو بەڵام زۆر خــۆش و نەرم و دڵبــزوێن بــوو. بەتــایبەت یەکێک لەو گۆرانییــانەی وا حــاجی مــراد پێــی خــۆش بــوو ســەرنجی بووتلێریشــی ڕاکێشــا بــوو. دەنگێکی پیاوانە و خەمــاوی و هەســت بزوێنــی هەبــوو. بووتلێر داوای لە دیلمانجەکە کردبوو بۆی وەرگێڕێتەوە.

نــاوەرۆکی گــۆرانییەکە، چیرۆکێکــی خەمــاوی و تــۆڵە خــوازانە بــوو. پەیمانێکی قایم بوو وەک ئەو پەیمانەی حاجی مراد و خەنیفە پێکەوە بەستبوویان و تەنیا مەرگ لە یەکی جیا دەکردنەوە:

دایە...دایە!
خاکی گۆڕەکەم ویشک دەبێتەوە
تۆش لە بیرم دەبەیتەوە.
باوکە...باوکە!
پۆلی گیاوگژ لە سەر گڵکۆکەم دەڕسکێت و
تۆ داخ و خەمی نەبوونم لە سەر دڵت دەسڕیتەوە.
تۆش ئەی خوشکەکەم!
ئەو کاتە فرمێسکی چاوت ویشک دەبێ

خەمی منیش باڵ لێدەدا و گوێسوانەی دڵت جێ دێڵێ.
بەڵام تۆش ئەی برای گەورەم!
هەتا تۆڵەم لە دوژمنان نەکەیتەوە
دڵنیام من لە بیری خۆت نابەیتەوە.
تۆش ئەی برای مێرمندالّم!
هەتا لە پاڵما ڕانەکشێی
تەمی خەم نارەوێ لە سەر شووشەی دڵت.
ئەی گوللەی گەرم! ئەی پەیام هێنی مەرگ و نەمان!
خۆ لە بیرتە عومرێک گویڕایەڵی من بووی.
تۆش ئەی خاکی ڕەشی گڵکۆم!
خۆ لە بیرتە ئەسپەکەی من
چۆن دەیشێلای بەزەبری سم،
لە سەر سینگت وێرغە و سمکۆڵانی دەکرد.
ئەی مەرگ تۆش
هاتووی هەناسەی ساردی خۆت
بە گەرووومدا بدەمێنی!
ئەوە منم دەتبەزێنم:
خاک جەستەم لە تۆ دەستێنێتەوە.
خودای ئاسمانیش ڕۆحم.

حاجی مراد هەمیشە کاتی بیستنی ئەو گۆرانییە چاوی دەقووچاند و ڕۆحی دەکەوتە سەر باڵی خەیاڵێکی ئاسمانی و بە زمانی ڕووسی دەیگوت: «گۆرانییەکی دڵبزوێنە؛ ئاوازێکی ژیرانەیە.»

بووتلێر، دوای هاتنی حاجی مراد و هاودڵ بوون لەگەڵ خۆی و مریدەکانی، شێعری ژیانی پڕ لە ڕاز و ئەشق و هەستی چیانشینەکان،

کاری لە ڕۆحی کرد و هەستی خۆشەویستیی ئەوان دڵی داگرت. هەر بۆیە بەشمیتێک و چەرکەسی و بەلەکپێچی کڕی و خۆی بە چیانشین دەزانی و وەک ئەوان دەژیا و هەڵسوکەوتی دەکرد.

ڕۆژی هاتنی حاجی مراد، عەمید چەند ئەفسەری دیکەی بانگهێشتن کرد و بۆ پێشوازی کردن میوانییەکی پڕ شکۆی ساز کرد. چەند کەس لە دەوری ئەو مێزە کۆبووبوونەوە کە ماریا دیمیتری یۆڤنا سەماوەرەکەی لە سەر دانابوو؛ چەند کەسیش لە دەوری مێزێک دانیشتبوون کە ڤۆدکا و چیخیر و ساردی و بیرەی دیکەیان لە سەر چنیبوو. حاجی مراد جلوبەرگی سەفەری لە بەردا و بە هەنگاوی گورج و خێرا هاتە ژووریێ.

هەمووان لە بەری هەستان و دەستومشتاخیان لەگەڵ کرد. بووتلێر قەنەفەیەکی پیشان دا و داوای لێکرد لە سەری دانیشێ؛ بەڵام حاجی مراد لە سەری دانەنیشت؛ سپاسی لێکرد و چوو لە سەر کورسیلەیەکی بەر پەنجەرەکە دانیشت.

ئەو بێدەنگییەی دوای هاتنی ئەو کوڕەکەی داگرت، نە تووشی خەجاڵەتی کرد و نە وای لێکرد هەست بە شەرمەزاری بکات. بە وردی چاوی بە ئامادە بوواندا گێڕا. بە ساردوسڕی چاوی لەو مێزەش کرد کە سەماوەرەکە و خواردنی دیکەی لە سەر بوو.

پێترۆکۆڤسکی[82] ئەو ئەفسەرە سەروڕووخۆشەی بۆ یەکەم جار بوو چاوی بە حاجی مراد کەوتبوو، داوای لە دیلمانجەکە کرد لێی بپرسێ تفلیسی پێ خۆشە یان نا؟

بە زمانی خۆی گوتی: «بەڵێ» و دیلمانجەکە وەرگێڕایەوە.

---

82- Petrokovsky

«چ شتێکی ئێرەت بە دڵە؟»

حاجی مراد لە وەڵامدا گوتی زیاتر لە هەموو شتێک لێرە شانۆ سەرنجی ڕاکێشاوە.

«کۆڕی هەڵپەڕکێ و سەمای ماڵی فەرماندەری گشتی چی؟»

حاجی مراد تۆزی نێوچاوانی گرژ کرد و گوتی: «هەر گەلێک ڕێوڕەسم و داب و نەریتی خۆی هەیە. ژنانی ئێمە جلوبەرگی لەو شێوەیە لە بەر ناکەن و لە لای ئێمە باو نییە.» بە دەم وتنی ئەو قسانەوە چاوی لە ماریا دیمیتری یۆڤنا کرد.

«ئەوانت بە دڵ نەبوو؟»

حاجی لە لایەن دیلمانجەکەوە وەڵامی دایەوە: «ئێمە پەندێکمان هەیە دەڵێ: گوێدرێژ سەگی بانگهێشتن کرد و ئالیکی کردە بەری، سەگیش لە ماڵی خۆی یەسقانی بۆ گوێدرێژەکە دانا؛ هەر دووکیان بە برسییەتی سەریان نایەوە.» پاشان زەردەیەکی گرت و گوتی: «ڕێوڕەسم و داب و نەریتی هەر نەتەوەیەک بە لای خۆیەوە پیرۆزە.»

ئیتر درێژەیان بە ئاخافتن نەدا. چەند کەس لە ئەفسەرەکان چاییان هەڵگرت و هێندێکیشیان شتی دیکە. حاجی مراد پەرداخێ چایی کە بۆیان هێنا هەڵیگرت و لە بەر دەمی خۆی داینا.

ماریا دیمیتری یۆڤنا داوای لە حاجی مراد کرد نانی خامەدار هەڵگرێ. حاجی مراد سەری ڕێزی بۆ دانەواند.

بووتلێر گوتی: «وادیارە کاتی ئەوەیە خوداحافیزی بکەین.»

حاجی مراد بە پێکەنینەوە و بە زمانی ڕووسی گوتی: «هاوڕێی باشم! کات چەندە زوو تێدەپەڕێ!» بە سەری ئاماژەی بۆ ئەو لایە کرد کە دەبوو لێوەی بڕۆنە دەرێ.

ئیلدار هات و لە نێو دەرگانەکەدا ڕاوەستا. ڕووبەندێکی درێژی بە دەستێکەوە و شمشێرێکی بە دەستەکەی دیکەیەوە گرتبوو. حاجی مراد ئاماژەی بۆ کرد. ئیلدار بە هەنگاوی خێرا و پتەو هات بۆ لای و ڕووبەندە سپییەکە و شمشێرەکەی پێدا. حاجی مراد هەستا. ڕووبەندەکەی دا بە سەر دەستیدا و شتێکی بە دیلمانجەکە گوت، ڕۆیشت بۆ لای ماریا دیمیتری یۆڤنا و ڕووبەندەکەی پێشکەش کرد.

دیلمانجەکە گوتی: «دەڵێ ئێوە دڵتان لەو ڕووبەندە چووە؛ دەیهەوێ ئەو دیارییەی لێ وەرگرن.»

ماریا سوور هەڵگەڕا و گوتی: «بۆچی؟ من ئەوە چێ لێبکەم؟.»

«دەبێ وەریگری، ئەوە پێشکەشییە و نابێ دەستی ڕەد کەیەوە.»

ماریا ڕووبەندەکەی وەرگرت و گوتی: «زۆر سپاس. هیوادارم کوڕەکەت ڕزگار بێ و بنەماڵەکەشت نەجاتیان بێ.»

حاجی مراد چاوێکی لە ماریا کرد و بە نیشانەی ڕەزایەت سەری لەقاند. پاشان شمشێرەکەی لە ئیلدار وەرگرت و دای بە عەمید. عەمید بە دیلمانجەکەی گوت: «منیش دەمهەوێ ئەو جوانووە ئەسپە کوێتەی پێشکەش بکەم، حەز دەکەم لێم قەبووڵ بکات. هیچی دیکەم نییە پێشکەشی بکەم.»

حاجی مراد دەستی ڕاتەکاند بۆ ئەوەی تێبگەیێنێ پێویستی پێی نییە و هیچی لێ وەرناگرێ. پاشان ئاماژەی بە کوێستان و دڵی خۆی کرد و لە دەرگاکە چووە دەرێ. خێزانی ماڵەکە هەتا بەر دەرگا بەڕێیان کرد. ئەو ئەفسەرانەی لە ژوورەکەدا مابوونەوە شمشێرەکەیان لە کالانەکەی دەرهێنا و بەوردی چاویان لێکرد، هەمووشیان ئۆباڵیان کێشا کە ئەسڵە و شمشێری جەوهەرداره.

بووتلێر هەتا بەر هەیوانی ماڵەکە حاجی مرادی بەڕێ کرد. لەو کاتەدا لە ناکاو ڕووداوێک قەوما، ئەگەر حاجی مراد وریا نەبووایە و خۆی نەپاراستبایە گیانی لە دەست دەدا.

دانیشتووانی گوندی تاش کیچوو[83]، لەگەڵ ڕووسەکان هاوڕا بوون و ڕێزێکی تایبەتیان بۆ حاجی مراد دادەنا. هەموو هاتبوون لە نزیکەوە ئەو نایبە بەناوبانگە ببینن. سێ ڕۆژ لە مەوبەر هەواڵیان ناردبوو کە ڕۆژی هەینی دەچێتە مزگەوتەکەیان و لەگەڵیان کۆ دەبێتەوە. بەڵام ئاغاکانی دانیشتووی تاشکیچوو دوژمنی قەستەسەری حاجی مراد بوون و بە خوێنی سەری تینوو بوون. کاتێک ئاگادار بوون بڕیار وایە حاجی مراد بچێت بۆ مزگەوتی گوندەکە، بە خەڵکیان ڕاگەیاندبوو ڕێگە نادەن ئەو پێ بنێتە مزگەوتەکەوە. خەڵکەکەش بەو هەڕەشەیەی ئاغاکان تووڕە بووبوون و شەڕ و تێکهەڵچوون دەستی پێکردبوو. کاربەدەستانی ڕووسی خەڵکەکەیان هێور کردبۆوە و بە حاجی مرادیان ڕاگەیاند بوو نەچێت بۆ مزگەوتی گوندەکە.

حاجی مراد ڕازی بووبوو نەچێت بۆ مزگەوت. هەمووان پێیان وابوو کێشەکە دامرکاوە و کۆتایی پێ هاتووە، بەڵام لەو کاتەدا کە حاجی مراد پێی نایە دەرگانەی ماڵەکە و ڕۆیشت بۆ لای ئەسپەکان کە لەوی ڕاگیرابوون و چاوەڕوانی بوون، یەکێک لە ئاغاکانی ناوچە ـ بە ناوی ئەرسەلان خان کە دۆستی بووتلێر و عەمید بوو، هاتبوو بۆ بەر دەرگای ماڵەکە «هەر کە چاوی بە حاجی مراد کەوت شەشلوولەکەی لە بەر پشتێنەی دەرهێنا و سێرەی لە حاجی مراد گرت. بەڵام بەر لەوەی قامک بە پەلەپیتکەدا بنێ، حاجی مراد

---

83- Kicha_Tash

سەرەڕای شەلین، وەک تێسکەی تفەنگ لە بەر هەیوانەکەوە بازی دا خوارێ و گوللەکەی ئەرسەلان خان لە دیوارەکە درا. حاجی مراد بە دەستێکی هەوساری ئەسپەکەی ئەرسەلان خانی گرت و بە دەستەکەی دیکەی خەنجەری هەڵکێشا و بە زمانی تاتاری دەنگی هەڵبڕی و گوڕاندی بە سەریدا. بووتلێر و ئیلدار هەریەک بەلایەکدا هەڵیانکوتا سەری و قۆڵیان گرت.

عەمید بە بیستنی تەقەی شەشلوولەکە لە ماڵێ دەرپەڕی. کە ڕووداوەکەی بۆ دەرکەوت گوتی: «ئەرسەلان، ئەوە کارە؟ شەرم ناکەی لە ماڵەکەی خۆمدا هێرش دەکەیە سەر میوانەکەم؟ ئەگەر پیاوی لە مەیدانی شەڕدا لە هەمبەریدا ڕاوەستە و چۆنت پێخۆشە وابکە، بەڵام شەرمە بۆ تۆ دەتهەوێ لە ماڵەکەی مندا خوێن بڕێژێ.»

ئەرسەلان خانی کورتە باڵا و سێمێڵ ڕەش، بە ڕەنگی بزرکاو و دەست و لاقی لەرزۆکەوە لە ئەسپەکەی دابەزی و بە ڕقەوە چاوی لە حاجی مراد کرد و شان بە شانی عەمید ڕۆیشت و چووە ژوورێ.

بووتلێر لە دیلمانجەکەی پرسی: «بۆ دەیویست بیکووژێ؟»

دوای وەڵام دانەوەی حاجی مراد دیلمانجەکە گوتی: «ئەوە یاسای ئەوانە. کۆنە ڕقە و خوێن و خوێنخوازییان لە نێواندایە. هەر بۆیە ئەرسەلان خان ویستی بیکووژێ و تۆڵەی لێ بکاتەوە.»

بووتلێر لێی پرسی: «ئەگەر لە ڕێگا تووشی بووایە چی ڕووی دەدا؟»

«دیارە ئەگەر منی بکوشتایە نیشانەی ئەوە بوو خواستی خودایە و لەگەڵ ویستی خودا هیچ ناکرێ.»

جارێکی تر بە زمانی ڕووسی خوداحافیزیی کرد. هەوساری ئەسپەکەی گرت. چاوێکی بە هەموو ئەو کەسانەدا گێڕا کە بۆ بەڕێ

کردنی هاتبوونە دەرێ. کاتێک چاوی بە ماریا دیمیتری یۆڤنا کەوت، گوتی: «خودا حافیز کچەکەم. زۆر سپاس بۆ میواندارییەکەت.»

ماریا گوتی: «خودات لەگەڵ بێ. لە خودام داوایە بتوانی بنەماڵەکەت ڕزگار بکەی.»

حاجی مراد لە قسەکەی ماریا تێنەگەیشت بەڵام هەستی بە مێهرەبانییەکەی کرد و سەری لەقاند.

بووتلێر گوتی: «دۆستی خۆت لە بیرنەکەی.»

حاجی مراد داوای لە دیلمانجەکە کرد تێی گەێنێ کە ئەو دۆست و هاوڕێی ڕاستەقینەیەتی و هیچ کات لە بیری ناکا.

سەرەڕای شەلینەکەی، گورج و خێرا خۆی هەڵدا و لە سەر زینەکە قیت و قۆز دانیشت. هێشتا لاقی لە سەر ڕکێفەکە دانەنابوو بێ ئیختیار دەستی برد بۆ خەنجەرەکەی و شمشێرەکەی ڕاستەوپاستە کرد. پاشان بە شێوەیەکی لووتبەرزانە کە تەنیا تایبەتی چیانشینەکانی قەفقازە، جۆرێک لەسەر ئەسپەکەی دانیشت کە دەتگوت سوار و ئەسپ بوونەتە یەک پەیکەرە. لە ماڵی عەمید دوور کەوتەوە. خەنیفە و ئیلداریش کە سوار بووبوون بە شێوەیەکی دۆستانە ماڵئاواییان لە خانە خوێکەیان کرد و بە یۆرغە بە دوای سەرکردەکەیاندا ڕۆیشتن.

هەر وەک باوە، دوای ڕۆیشتنی حاجی مراد ئەوانەی هاتبوونە دەرێ و بەڕێیان کرد، دەستیان کرد بە باس کردنی.

«بەڕاستی پیاوێکی بە جەرگ و دڵ شێرە!»

«وەک گورگ شالاوی بۆ ئەرسەلان خان برد. دیتت چۆن قەلافەتی گۆڕا؟»

پترۆکۆڤسکی گوتی: «لەو فێڵەبازانەیە کە هیچ کەس دەسکی لە دوو ناکا!»

« بریا لەو ڕووسە فێڵەبازانە زۆرمان هەبووایە!»

لەناکاو ماریا دیمیتری یۆڤنا وەدەنگ هات و گوتی: «ئەو پیاوە حەوتوویەک لەگەڵ ئێمە ژیا. جگە لە چاکە و ئەدەب و ئەقڵ و ویژدان چ شتێکی دیکەتان پێوە دی؟»

«هەموو ئەوانەت چۆن بۆ دەرکەوت؟»

«من هەر بەڕاستی وا تێگەیشتم.»

عەمید لەو کاتەدا هاتە ژووریَ و گوتی: «بە جاریَ شەیدای بووە.»

«دەی گریمان شەیداشی بووبێتم، بە ئێوە چی؟ بۆ پاشملە باسی کەسێکی ئاوا باش و نەجیب دەکەن؟ ڕاستە پیاوێکی تاتارە، بەڵام مرۆڤە و مرۆڤێکی باشیشە.»

بووتلێر گوتی: «ماریا دیمیتری یۆڤنا! بە ڕاستی هەق بە تۆیە شەیدای بی و لایەنگریی لیَ بکەی.»

## بیست و یەک

بارودۆخی بەرەگەی شەڕ لە چێچێن بە شێوەی ئاسایی بوو. لە کاتی قەومانی ئەو ڕووداوەوە کە باس کرا، دوو جار شووتەی مەترسی لێدرا بوو. دوو لیوا لە حاڵی ئامادە باشدا بوون و هێزی تایبەتیان هێنابوو بۆ بەرگری. بەڵام هەر دوو جارەکە لە هەمبەر پلان و ئازایەتیی چیانشینیاندا خۆیان نەگرتبوو و ناچار بووبوون پاشەکشێ بکەن. جارێکیش لە ویزدۆیژنسک توانییان کازاخێک بکووژن و ئەو هەشت ئەسپەی هێنا بووی ئاویان بدات دەستیان بە سەردا بگرن. دوای ئەو هێرشەی کە بووە هۆی کاول بوونی گوندەکە ئیتر ۆێزەکانی ڕووس ئۆپەراسیۆنی دیکەیان ئەنجام نەدا. چونکە شازادە باریاتینسکی[٨٤] کرابووە فەرماندەی باڵی چەپی سپاکە و خەریکی داڕشتنی پلانێکی تۆکمە و بەربڵاو بوو.

باریاتینسکی لە دۆستانی لە مێژینەی نایب سەڵتەنە و یەکێک لە فەرماندەرانی پێشووی لیوای کابارادا[٨٥] بوو. کاتێک وەک فەرماندەری باڵی چەپ گەیشتە گرۆزنی، لەڕێوە دەستەیەک سەربازی ئازا و چاونەترسی پڕچەک و ئامادە کرد بۆ ئەوەی فەرمانی تێزار بەڕێوە بەرن، کە لە لایەن چێرنیشۆڤەوە بە وێرنیتۆڤ ڕاگەیەندرا بوو. ئەو هێزەی لە ویزدویژنسک کۆبووبوونەوە لە قەڵاکە هاتبوونە دەرێ و لە

---

84- Baryatinski
85- Kabarada

نزیک کوورین[86] جێگیر بووبوون. لەوێ هوردوویان لێدا و دەیستیان کرد بە بڕینی دارستانەکە.

ڤۆرۆنتسۆڤی لاو لە خێوەتێکی پڕ شکۆدا نیشتەجێ بوو و زۆربەی کاتەکان ماریا ڤاسیلییۆڤنای ژنی دەهات بۆ لای و شەوانە لە لای دەمایەوە. پێوەندیی ماریا ڤاسیلییۆڤنا و باریاتینسکی بووبووە بنێشتە خۆشکەی سەرزاران. هەموو سەربازەکان و تەنانەت ئەو ئەفسەرانەی لە چینی خانەدانیش نەبوون باسی ئەو کەینوبەینە پڕ شوورەیی و ناحەزەیان دەکرد. ئەو شەوانەی ژنە دەهات بۆ هوردوو ئەوان ناچار دەکران لە خێوەتەکان دووربکەنەوە و لە بۆسەدا بن بۆ ئەوەی ئەوان خەریکی کەیف و نەهەنگی خۆیان بن و بە خۆشی ڕایبوێرن. چیانشینەکان هێندێ جار تۆپەکانیان زۆر نزیک دەکردەوە و بە جوانی دەیانتوانی هوودووگاکە تۆپباران بکەن. تۆپەکان کەم وابوو ئامانجەکە بپێکن؛ کەوایە لە کاتە ئاساییەکاندا پێویست نەبوو بۆ بەرگری کردن لە تۆپبارانی چیانشینان هەوڵ بدەن. بەڵام ئێستا سەربازەکان دەبوو لە دەرەوەی هوردووگا کەمین دانێن و نەهێڵن چیانشینەکان نزیک ببنەوە و ببنە هۆی ترس و دڵە ڕاوکێی خاتوو ماریا ڤاسیلییۆڤنا. هەموو شەوێ هەتا بەیانی سەربازەکان لە بۆسەدا دەمانەوە، تەنیا لە بەر ئەوەی ئەو خاتوونە خانەدانە دڵی ئاسوودە بێ و کەیف و ڕابواردنەکەی لێ تێک نەچێ. هەر بۆیە ئەو سەرباز و ئەفسەرانەی ڕێگەیان نەبوو لە کۆڕ و کۆبوونەوەی خانەدانەکاندا بەشداری بکەن، پاشملە باسی خاتوو ماریا ڤاسیلییۆڤنایان دەکرد و ددانی خێریان پێدا نەدەهێنا.

---

86- Kurin

بــووتلێر مــۆڵەتی لە خزمەتکردنــی نێــو قەڵا وەرگــرت و هــات بــۆ هوردووگا تاکوو چاوی بە هاوسـەفەر و هاوڕێکانی مەدرسـەی نیزام و ئەفســەرانی هاوقەتــاری بــکەوێ کە لە کۆرینســک لەگەڵ یەک ئاشــنا بووبوون. سـەرەتا زۆر خۆشـی ڕابوارد. لە خێوەتەکەی پۆلتۆراتسکی دا نیشــتەجێ بــوو و دۆســتان و هاوڕێیــانی پێشــووی زۆر بە گەرمــی پێشــوازییان لێکـرد. چـوو بـۆ سـەردانی ڤۆرۆنتسـۆڤ کە مـاوەیەک لە لیـواکەی ئەوان خزمەتـی کردبـوو و سـووکە ئاشـنایەتییەکیان هەبـوو. ڤۆرۆنتسۆڤ بە ڕوویەکی خۆشەوە بەخێرهاتنی کرد و بە باریاتینسکیی ناسـاند. باریاتینسـکی، بـووتلێری بـۆ میـوانییەک بانگهێشـتن کـرد کە بـۆ ڕێزگـرتن لە ژنیـراڵ کازلۆڤسـکی سـاز کرابـوو. کازلۆڤسـکی هەتـا کـاتی هاتنی باریاتینسکی فەرماندەی بەرەگەی چەپ بوو.

میـوانییەکە زۆر خـۆش و ڕێکوپێـک بـوو. ڕیزێـک خیـوەتی تایبەتیـان هەڵدابوو. کورسییەکانیان بەڕیز لە بەرێکی خیوەتەکە دانا بوو. لە سـەر مێزەکـان، قـاپ و دەوری و کەوچکـی نـان خـواردن و هەمـوو جۆرێـک بتریی مەشرووب و ساردی ڕیز کرابوون. هەموو شتەکان وەک شێوە ژیـانی گـاردی سـەڵتەنەتی لە پترزبۆرگ دەچوون. سـەعات دوو لە سـەر کورسییەکان دانیشتن. کازلۆڤسکی لە نێوەڕاستی ڕیزەکە و باریاتینسکی بەرەوڕووی دانیشــتبوو. ڤۆرۆنتســۆڤ و هاوسەرەکەشــی لەم شــانە و شانی کازلۆڤسکی دانیشتبوون. لە هەر دوو بەری مێزەکیان، ئەفسـەرانی لیــوای کابــارادا و کــوورین دانیشــتبوون. بــووتلێر شــان بە شــانی پۆلتۆراتســکی دانیشــتبوو. شــاد و بەدەمــاخ و ســەرخۆش لەگەڵ ئەفســەرەکانی تەنیشـتی گـاڵتە و گەپیـان دەکـرد و پێـک لە دوای پێـک شەراب و ڤۆدکایان هەڵدەدا.

کاتێک کەبابی بەرخیان خوارد و خزمەتکارەکان پەرداخەکانیان پڕ کرد لە شامپانی، پۆلتۆراتسکی ڕووی لە بووتلێر کرد و بە نیگەرانییەوە پێی گوت: «ئێستا کاتی ئەوەیە جەنابی ( چونکە) بە چەکمەوە تێی کەوێ!»

«چۆن؟!»

«چۆنی ناوێ، دەبێ وتار پێشکەش بکات! بەڵام کوا ئەویان گوتووە و وتاردان؟ وتاردان لەگەڵ شکاندنی ڕیزی دوژمن لە ژێر ڕێژنەی گوللە و ئاگردا، جیاوازە. ئەویش کاتێک کە شازادە شان بە شانی دانیشتبێ و ئەو هەموو ئەفسەرە خانەدانە بەردەنگی بن.»

ئەفسەرێک کە لە تەنیشتیان دانیشتبوو گوتی: «تەنانەت چاو لێکردنیشی کارێکی دژوارە.»

کاتی دیاری کراو هات. باریاتینسکی هەستا، پەرداخەکەی هەڵگرت و هێندێک لەمەڕ کازلۆڤسکییەوە دوا. دوای ئەو کازلۆڤسکیش هەستا و بە دەنگێکی بەرز گوتی:

«بە پێی فەرمانی خاوەن شکۆ حەزرەتی تێزار من لە خزمەتی ئێوە مەرەخەس دەبم. دابڕان لە ئێوە بۆ من زۆر دژوارە بەڵام دڵنیابن هەمیشە لە بیری ئێوە دام و لە دڵمدا دەژین. بەڕێزان پەندێک هەیە دەڵێ: «پیاوێک کە لە بەرەگەی شەڕ تەنیایە ئیتر خەباتگێڕ نییە.» هەمووتان ئەو پەندەتان بیستووە و لەو ڕاستییە ئاگادارن. کەوایە چونکە ئەوی پاداشی پێم دراوە، چونکە کەرەمی لە ڕادەبەدەر و دڵ فراوانیی خاوەن شکۆ، دەریائاسایی بە سەرمدا ڕژاوە، چونکە هەموو نیشانە و پلەوپایەکانم، چونکە هەموو ناوی باش و چونکە هەموو شتێکم و چونکە هەرچی هەمە (لێرەدا زمانی کەوتە تەتەڵە و دەنگی لەرزی) لە سایەی سەری ئێوە و تەنیا ئێوەوەیە، هاوڕێیانی بەڕێزم!»

دەموچاوە چرچولۆچەکەی چرچولۆچتر و دڵی پڕ بوو و ئۆناقێک گەرووی گرت. فرمێسک بە چاویدا هاتە خواریێ: «چلۆن لە ناخی دڵمەوە گەرمترین سپاس و پێزانینی خۆمتان پێشکەش بکەم...»

کازلۆڤسکی ئیتر نەیتوانی درێژەی پێبدا؛ دەستی کرد بە دەستومشتاخ و لە ئامێز گرتنی ئەو ئەفسەرانەی لە دەوروبەری بوون. هەموویان هەستیان جووڵابوو. شازادە خانم دەسرەیەکی بەبەر دەمولووتییەوە گرتبوو. شازادەکەوتە چاوترووکاندن و دەمی قووچاند؛ دیار بوو دڵی پڕ بووە. زۆربەی ئەفسەرەکان چاویان فرمێسکی تێزابوو. تەنانەت بووتلێریش کە کازلۆڤسکیی نەدەناسی، نەیتوانی ددان بە خۆیدا بگریێ و نەگری. هەموو ئەوانەی بە دڵ بوو. پاشان بادەنۆشی دەستی پێکرد: بە خۆشیی بارياتینسکی، بە خۆشیی ڤۆرۆنستۆڤ، بە خۆشیی ئەفسەران و سەربازان. لە کۆتاییدا میوانەکان لە سەر مێزەکان هەستان. مەستی شەراب و مەستی هەستی شادی بزوێنی نیزامی بوون و بۆ ئەو چەشنە مەستییە بە گیان و دڵ ئامادە بوون.

هەواکەی زۆر خۆش بوو: تاووساو، ئارام و نەشەبزوێن. لە هەموو لایەکەوە دەنگی ئاگربازی و بەزم و گۆرانی دەهاتە گویێ. دەتگوت هەمووان ڕووداوێکی خۆش و ویژدان بزوێنیان کردووە بە جێژن. بووتلێر بەو پەڕی شادی و سەرخۆشییەوە چوو بۆ لای پۆلتۆراتسکی. چەند ئەفسەر لەویێ کۆبووبوونەوە و خەریکی یاریی پاپەزێن بوون و وەرەقیان بڵاوکردبۆوە. یاوەرێک یەکسەد ڕۆبڵی دانا و کردییە بانکی یارییەکە. بووتلێر دوو سێ جار لە خێوەتەکە چووە دریێ. دەستی لەو کیسە پارەیەدا کە لە گیرفانیدابوو، بەڵام ئاخری نەیتوانی لە هەمبەر وەسوەسەی خۆیدا خۆڕاگری بکات. بە پێچەوانەی ئەو بەڵێنەی بە خۆی و براکەی دابوو، دەستی کرد بە قومار کردن. هێشتا سەعاتێک

تێنەپەڕیبوو، سوور هەڵگەڕا و عارەقەی دەردا و هەر دوو هەنیشکی لە سەر مێزەکە دانا و دەستی کردە کوڵەکەی چەنەی و دەیویست ئەو گوژمە پارەیە بژمێرێ کە دۆڕاندبووی. هێندەی دۆڕاندبوو لە ترسانا نەیدەوێرا حیسابی بکات، بەڵام دەشیزانی تەنانەت ئەگەر تەواوی مووچەی مانگانەکەی وەرگرێ و ئەسپەکەشی بفرۆشێ ناتوانێ قەرزی ئەو یاوەرە بداتەوە کە قوماری لەگەڵ کردبوو، ئەوەی زیاتر لە دۆڕاندنەکە ئازاری دەدا، ناسیاو نەبوونی ئەو یاوەرە بوو. ئەگەر یاوەرەکە بە هۆی دۆڕاندنی لە ڕادەبەدری بووتلێر وازی لە قومارەکە نەهێنایە، بووتلێر هەروا درێژەی پێدەدا و لە ڕووی هەڵنەدەهات بکشێتەوە. بە پەشۆکاوی گوتی ئەو گوژمە پارەیەی پێ نییە و دەبێ لە بنەماڵەکەی وەرگرێ و بیداتێ. کەوتبووە ژێر باری قەرزێکی زۆر قورسەوە. بۆشی دەرکەوت دوای ئەو قسەیە تەنانەت پۆلتۆراتسکیش نایهەوێ چاو لە چاوی بکات و نیگای خۆی لێ دەدزییەوە. دوایین شەوی مانەوەی بوو و لە ئەوێ و بیری دەکردەوە واباشتر بوو خۆی لە قەرەی ئەو قومارە نەدایە. خوزگە بە جێی قومار، بچوایەت بۆ لای ڤۆرۆنتسۆڤ کە بانگهێشتنی کردبوو. ئەگەر ئەو کارەی بکردایە، تووشی ئەو کێشەیە نەدەبوو؛ بەڵام ئێستا تووشی بارودۆخێکی زۆر خراپ بووبوو و نەیدەتوانی لە ژێر باری ئەو قەرزە قورسە بێتە دەرێ.

ماڵئاوایی لە دۆستان و هاوڕێیانی کرد. بە سواری گەڕایەوە بۆ ماڵێ و یەکسەر چووە سەر پێخەفەکەی خەوی لێکەوت. وەکوو هەموو ئەو کەسانەی کە گوژمەیەکی بەرچاو پارە دەدۆڕێنن، هەژدە سەعاتی ڕەبەق خەوت. ماریا دیمیتری یۆڤنا بە چاوپێکەوتنی بووتلێر و ڕەنگ بزرکانی بۆی دەرکەوت خەمێکی لە دڵدایە؛ کاتێک داوای پەنجا کۆپکی لێکرد بۆ

ئەوەی بیـدات بەو کـازاخەی لەگەڵیـدا هـاتبوو، تێگەیشـت لە قومـاردا دۆڕاندوویەتی. هەر بۆیە عەمیدی سەر کۆنە کرد کە مۆڵەتی پێداوە.

ڕۆژی دوایی لای نیوەڕۆ لە خەو هەستا و وەبیری هاتەوە چ قوڕێکی بـۆ خـۆی گرتـۆتەوە و تووشـی چ بـارودۆخێکی خـراپ بـووە. ئـاواتی دەخواست دیسان خەوی لێ بکەوێتەوە و بگەڕێتەوە بۆ نێو دنیای بێ خەیـاڵی؛ بەڵام ئەوە نەدەلـوا. دەبـوو هەوڵ بـدات و چوارسـەد ڕۆبـڵ دەستەبەر بکات و بێدات بەو کابرا غەوارەیەی لە قوماردا لێی بردبۆوە. یەکەم بیـر کە بە مێشـکیدا هـات ئەوە بـوو کە نـامەیەک بـۆ بـراکەی بنووسـێ. دەسـتی کـرد بە نووسـینی نـامەکە و داوای لە بـراکەی کـرد پێنجسـەد ڕۆبڵـێ بە قەرز بـداتێ و لە هەمـبەردا ئەو ئاشـە هەڵگـرێ بـۆ خـۆی کە پـێکەوە شـەریک بـوون. پاشـان نـامەی بـۆ خزمێکـی ڕژد مستقووچاوی خۆیـان نووسـی و داوای لێکرد پێنجسـەد ڕۆبڵێ بە قەرز بـداتێ و بـۆ بەهرەکەشـی دەمـی خـۆی قەپـان بـێ و هەر چەنـدێک بڵـێ دەیداتێ. دوای ئەوە چوو بۆ لای عەمید. دەیزانـی ئەو و ماریـا پارەیـان بە دەستەوە هەیە، بۆیە داوای لێکردن پێنجسـەد ڕۆبڵێ بە قەرز بدەنێ.

عەمید گوتی: «من هیچ قسەیەکم نییە بەڵام ماشا نـاهێڵێ. ئەو ژنەتیوە هێنـدە چکـووس و نینۆکـوشـکە هیچـی لە دەسـت هەڵنـاوەرێ. ژنـان هەموویـان هەروان و شـەتیان دەرەقەتیـان نـایە. بەڵام هەر چونێکە دەبێ چارەسـەرێک بـۆ ئەو کێشـەیە بـدۆزییەوە. بڵێـی خـاوەنی مـۆتێلەکەی گەڕەک نەیبێ بە قەرز لێی وەرگری؟»

چـوو بـۆ لای کـابرای خـاوەن مـۆتێلیش، بەڵام بە دەسـتی خـاڵی و هیوابڕاوی گەڕایەوە. تەنیا هیوای بووتلێر براکەی و ئەو خزمە جەبوون و نۆکیسەیان بوو.

## بیست و دوو

حاجی مراد دوای بێ هیوامانەوە لە چێچێن، گەڕایەوە بۆ تفلیس. هەر کاتێک بیویتسبایە دەیتوانێ بچێت بۆ سەردانی ڤۆرۆنتسۆڤ، داوای لە نایب سەڵتەنە دەکرد بەندییە سیاسییەکان لەگەڵ بنەماڵەکەی بگۆڕێتەوە دەیگوت هەتا بنەماڵەکەی ئازاد نەبن و لەو بابەتەوە خاترجەم نەبێ ناتوانێ بۆ لەنێو بردنی شامیل یارمەتیی ڕووسەکان بدات ڤۆرۆنتسۆڤیش دەستی دەستیی پێدەکرد و هەر جارەی بیانوویەکی دەدۆزییەوە. دەیگوت دەبێ ژینراڵ ئارگووتینسکی[87] بێت بۆ تفلیس بۆ ئەوەی لەو بارەوە قسە بکەن و بڕیار لە سەر ئەو کارە بدەن.

حاجی مراد داوای لە ڤۆرۆنتسۆڤ کرد ڕێگەی پێ بدات بێت بۆ نووخا[88] و ماوەیەک لەوێ بژی. نووخا شارێکی لاپەڕی ناوچەی قەفقاز بوو. پێی وابوو لەوێ باشتر دەتوانێ لەگەڵ شامیل و دەست و پێوەندەکانی دانووستان بکات و بنەماڵەکەی ڕزگار بکات. جگە لەوەش نووخا شارێکی موسڵمان نشین بوو و دەیتوانی بچێتە مزگەوت و پێنج فەرزەی نوێژەکانی بەجێ بێنێ کە نوێژ کۆڵەکەی دینی ئیسلامە. ڤۆرۆنتسۆڤ لەو بارەوە ڕاپۆرتێکی نارد بۆ پترزبۆرگ بەڵام ڕێگەی بە حاجی مراد نەدا بچێت بۆ شاری نووخا.

کێشەکەی حاجی مراد بەلای ڤۆرۆنتسۆڤەوە زۆر گرنیگ بوو، بۆ کاربەدەستانی باڵای پترزبۆرگ و ئەو کەسانەش کە پێشینەی حاجی مرادیان دەزانی هەموو ئەو ڕووداوانە دۆخێکی لەبار بوون و پێیان

87- Argutinski
88- Nukha

وابوو بابەتێکی زۆر سەرنج ڕاکێشە و قازانجی شەڕی قەفقازی لێ دەکەوێتەوە؛ بەڵام بۆ حاجی مراد قەیران و بارودۆخێکی زۆر تاڵ و دژوار بوو، کەوتبووە گێژاوی کێشەیەکی مەترسیدارەوە و نەیدەزانی چی بکات و چ ڕێوشوێنێک بگرێتە بەرە بەتایبەت لەم دواییانەدا هەستی دەکرد کەوتۆتە چاڵێکەوە هەر دوو بەری ئاگرە و ڕزگار بوونی مەحاڵە. هۆی ڕاکردنی لە کوێستان ڕزگار کردنی گیانی خۆی و بێزاری و نەفرەت لە شامیل بوو. کاتی هەڵاتن لە کوێستان سەرەڕای کێشە و دژواریی زۆر هەستی بە شادی و ئازادی دەکرد. ماوەیەکیش زۆر بە دڵخۆشی دەژیا و پلانی بۆ لە نێو بردنی شامیل دادەڕشت. بەڵام ڕزگار کردنی بنەماڵەکەی، کە بۆی دەرکەوتبوو کارێکی سانا نییە، زۆر لەوە دژوارتر بوو وا بیری لێدەکردەوە.

شامیل بنەماڵەکەی بە بارمتە گرتبوو و هەڕەشەی دەکرد ئەگەر حاجی مراد نەگەڕێتەوە و خۆی بە دەستەوە نەدا ژنەکانی هەر کام بۆ گوندێک دوور دەخاتەوە و چاوی کوڕەکەشی دەردەهێنێ، یان دەیکووژێ.

حاجی مراد هاتبوو بۆ شاری نووخا تاکوو بە یارمەتیی ئەو دۆستانەی کە لە داغستان بووی، پیلانێک داڕێژێ و بە فێڵ و تەڵەکە یان شەڕ و ئازایەتی بنەماڵەکەی لە چنگی شامیل ڕزگار بکات. دوایین سیخوڕ کە هات بۆ شاری نووخا هەواڵی هێنابوو کە ئاڤارییییەکانی گیانفیدای ئەو ئامادەن لە هەڵمەتێکدا بنەماڵەکەی ڕزگار بکەن و بیانهێنن بۆ لای ڕووسەکان. بەڵام پێویستیان بە هێزی زیاتر هەیە بۆ هێرش کردنە سەر گوندی ڤێدۆنۆ کە بنەماڵەکەی حاجی مراد لەوێ دیل کرابوون. تەنیا کاتێک دەیانتوانی بنەماڵەکەی نەجات بدەن کە لە ڤێدۆنۆ ڕایانگۆیزن و بیانبەن بۆ شوێنێکی تر. حاجی مراد پەیامی بۆ

لایەنگرەکانی نارد و ڕایگەیاند هەر کەس بنەماڵەکەی ڕزگار بکات سێ هەزار ڕۆبڵی خەڵات دەکات.

له نووخا ماڵێکی چکۆڵەی پێنج هۆدەییان له نزیک مزگەوتەکە و ماڵی حاکم دابوو بە حاجی مراد و لەوێدا دەژیا. ئەفسەرەکانی هاوڕێی و دیلمانج و مریدەکانیشی لەو ماڵەدا دەژیان. ژیانی حاجی مراد له چاوەڕوانیدا تێدەپەڕی و هەمیشە چاوەڕێ بوو قاسیدێک له کوێستانەوە بێت و هەواڵی ڕزگار بوونی بنەماڵەکەی بۆ بێنێ. یان جاروبارە دەچوو بۆ ئەسپ سواری له دەرەوەی شار و ڕێگەی ئەوەی پێدرا بوو.

ڕۆژی بیست و چواری ئاڤریل دوای گەڕانەوە له ئەسپ سواری، ئاگادار کرا کاتی نەبوونی ئەو قاسیدێک له لایەن ڤۆرۆنتسۆڤەوە هاتووە. لەگەڵ ئەوەی تامەزرۆ بوو بزانێ قاسیدەکە چ پەیامێکی هێناوە، ڕۆیشت بۆ ژوورەکەی خۆی. نوێژی نیوەڕۆی کرد. پاشان چوو بۆ ئەو ژوورەی کە ئەفسەری بەرپرس و قاسیدەکە چاوەڕوانی بوون. ئەو ژوورەش شوێنی دانیشتن و میوانداریی حاجی مراد بوو. ئەو قاسیدەی لە تفلیسەوە هاتبوو ناوی کریلوڤ[89] بوو، بە حاجی مرادی ڕاگەیاند کە ڤۆرۆنتسۆڤ دەیهەوێ ڕۆژی دوازدەهەم بچێت بۆ تفلیس بۆ ئەوەی چاوی بە ژنیراڵ ئارگوتینسکی بکەوێ. حاجی مراد ڕوخسار و قەڵافەتی قاسیدەکەی نەکەوتە بەر دڵ و بە تووڕەیی وەڵامی دایەوە: «یاخچی. پارەت هێناوە؟»

کریلوڤ وەڵامی دایەوە: «هێناومە.»

89- Kirillov

حاجی مراد گوتی: «بۆ دوو حەوتووا!» سەرەتا هەر دوو دەستی و پاشان چوار قامکی بەرز کردەوە: «بێنەبمدەیە.»

قاسید گوتی: «هەر ئێستا دەیدەمە خزمەتتان.» دەستی کرد بە نێو کیسەی کەلوپەلەکانیدا و پارەکەی دەرهێنا. پێی وابوو حاجی مراد ڕووسی نازانێ. بە زمانی ڕووسی گوتی: «پارەی بۆ چییە؟»

حاجی مراد حاڵی بوو. مۆڕەیەکی لێکرد. قاسید کە دەیویست پارەکە دەرهێنێ حەزی دەکرد لەگەڵ حاجی مراد قسە بکات بۆ ئەوەی کاتی گەڕانەوە بۆ لای ڤۆرۆنتسۆڤ هەواڵێکی پێ بێ. داوای لە دیلمانجەکە کرد لە حاجی مراد بپرسێ لێرە تاقەتی بە سەر نەچووە؟ حاجی مراد بە لاچاوێکی و بە مۆڕەوە لەو پیاوە کورتە باڵا و سەرسافەی ڕوانی کە جلوبەرگی سڤیلی لە بەردا بوو، وەڵامی نەدایەوە. دیلمانج دیسان پرسیارەکەی دووپات کردەوە. حاجی مراد نێوچاوانی تێک ناو گوتی: «پێی بڵێ هیچ قسەیەکم نییە، پارەکەم پێ بدات.»

لە سەر مێزەکە دانیشت پارەکان بژمێرێ. ڕۆژی پێنج دراوی ئاڵتوون مووچەی حاجی مراد بوو. کریلۆڤ پارەکانی دەرهێنا. حەوت ڕیزی دەدانەیی دانا و لە بەر دەمی حاجی مراد ڕیزی کردن. حاجی مراد دراوەکانی خستە گیرفانی چەرکەسییەکەیەوە و لە ناکاو چەپوکێکی بە سەری سافی کریلۆڤدا کێشا و هەڵیبەزاندەوە.

کریلۆڤ لە جێی خۆی دەرپەڕی و بە دیلمانجەکەی گوت: «بە حاجی مراد بڵێ مافی ئەوەی نییە ئاوا لەگەڵ من هەڵسوکەوت بکات، من کار بەدەستی دەوڵەتم و پلەپایەم بەرانبەری عەمیدە! ئەفسەرەکەش وتەکەی ئەوی پشت ڕاست کردەوە. حاجی مراد تەنیا سەری لەقاند تاکوو تێیان بگەیێنێ ئەوە دەزانێ. هەستا و لە ژوورەکە چووە دەرێ.

ئەفسەری بەرپرس گوتی: «ئەو کابرایە نازانم چیی لێ بکەین. سەر بخەیە سەری بە خەنجەرەوە ئاوقات دەبێ؛ هەر بۆیە قسەی لەگەڵ نایە. بەڵام وابزانم ژان بە جەرگی گەیشتووە و بۆی تامڵ ناکرێ.»

ئێوارە کاتێک وڵات تاریک داهات دوو سیخوڕی دەمامکدار لە کوێستانەوە هاتن بۆ لای حاجی مراد. یەکیان زبەلاح و ڕەشتاڵە و ئەوی دیکەیان پیرەپیاوێکی لاواز و داڵگۆشت بوو. ئەو هەواڵانەی هێنابوویان هیوابەخش نەبوون. لایەنگرانی حاجی مراد کە بەڵێنیان دابوو بنەماڵەکەی ڕزگار دەکەن، لە ترسی شامیل لە بەڵێنەکەیان پاشگەز بووبوونەوە. شامیل هەڕەشەی کردبوو هەر کەسێک یارمەتیی حاجی مراد بدات بە توندترین شێوە سزا دەدرێ. دوای بیستنی هەواڵی قاسیدەکان، حاجی مراد دەستەوئەژنۆ دانیشت و سەری کردە سەر چۆکی و ماوەیەکی زۆر بەو شێوەیە مایەوە. بیری دەکردەوە. بەشێوەیەکی جیددی بیری دەکردە. دەیزانی ئەمە لێبڕاوانەترین و دوایین بیر کردنەوەیەتی. دەبوو بڕیارێکی بەجێ بدات. لە ئاکامدا سەری بەرز کردەوە و هەر یەکی دراوێکی ئاڵتوونی دا بە قاسیدەکان و گوتی: «بڕۆن.»

«وەڵام چییە؟»

«بزانین خودا چیمان وەرێ دێنێ.»

قاسیدەکان هەستان و ڕۆیشتن. حاجی مراد لە سەر مافوورەکە دانیشتبوو. ئەژنۆی لە باوەش گرتبوو. ماوەیەکی زۆر دانیشت و بیری کردەوە.

"چبکەم؟ بڕوا بە قسەکانی شامیل بکەم و خۆم بە دەستەوە بدەم؟ بەڵام ئەو هێندە فێڵەبازە دەڵێی ڕێوییە! تەنانەت ئەگەر فریویشم نەدات، ناتوانم لە بەر دەستی ئەو سوورهوولی چڵدرۆیەدا کار بکەم.

مەحاڵە بتوانم بگەڕێمەوە بۆ لای، چونکە هاتوومەتە پاڵ ڕووسەکان و هەتا هەتایە دڵی لێم پاک نابێتەوە و متمانەم پێ ناکات."

ئەو ئەفسانەیەی چیانشینەکانی وەبیر هاتەوە. "مرۆڤەکان هەڵۆیەکیان گرت و هێنایان بۆ نێو خۆیان. هەڵۆکە دوای ماوەیەک ژیان لەگەڵ مرۆڤەکان، زەنگوڵەیەک لەملدا گەڕایەوە بۆ کوێستان و چووە نێو هاو ڕەگەزەکانی. هەڵۆکان ڕێگەیان پێنەدا و لە خۆیان تاراند. گوتیان: بگەڕێوە بۆ لای ئەو کەسانەی زەنگوڵەیان لەمل کردی. هەڵۆکە نەیدەویست لە چیا و هێلانە و هاوڕەگەزەکانی دوور بکەێتەوە؛ پێی چەقاند و نەڕۆیشتەوە بۆ لای مرۆڤەکان. هەڵۆکانیش حەزیان نەدەکرد هەڵۆیەکی زەنگوڵە لە مل لە نێو ئەواندا بێ، هەر بۆیە هێندەیان بە دەندووک و چڕنووک لێدا هەتا کوشتیان."

حاجی مراد بیری کردەوە: "ئەگەر بگەڕێمەوە بۆ لای شامیل بە دەردی هەڵۆکە دەچم. وا باشتر نییە لێرە بمێنمەوە و هەموو خاکی قەفقاز لە چنگ یاغییەکان دەرهێنم و پێشکەش بە تێزاری بکەم؟ ئەو کاتە ناوبانگی ئازایەتیم هێندەی دیکە بڵاو دەبێتەوە و دەبمە خاوەنی ناو و ناوبانگ و ماڵ و سامانێکی زۆر."

لە دڵی خۆیدا گوتی: "ئەوەش مەحاڵە." بیری لە دیدارەکانی لەگەڵ ڤۆرۆنتسۆڤ و وادە و بەڵێنەکانی شازادە کردەوە. بەڵام لە دڵی خۆیدا گوتی: "هەر ئێستا دەبێ بڕیاری خۆم بدەم دەنا شامیل بنەماڵەکەم لە نێو دەبات."

ئەو شەوە هەتا بەیانی خەو نەچووە چاوی. هەر وا بیری دەکردەوە و بارودۆخ و ڕێکارەکانی هەڵدەسەنگاند و لە بیری چارەسەرێکی گونجاودا بوو.

## بیست و سێ

لە نێوەشەودا بڕیاری خۆی دا. دەبوو ڕابکات و بگەڕێتەوە بۆ چیا. بە هاوکاریی ئەو داغستانیانەی کە هێشتا پێی وەفادار بوون، هێرش بکاتە سەر ڤێدۆنۆ و یان بنەماڵەکەی ڕزگار بکات یان لەو ڕێگایەدا سەری خۆی دانێ. بەڵام هێشتا بیری لەوە نەکردبۆوە دوای ڕزگار کردنی بنەماڵەکەی دەبێ چبکات. بۆ لای ڕووسەکان بگەڕێتەوە، یان بچێت بۆ خوونزاخ و هەڵکوتێتە سەر هێزەکانی شامیل؟ تەنیا شتێک کە ئێستا بیری لێدەکردەوە ڕاکردن لە لای ڕووسەکان و ڕوو لە چیا کردن بوو. دەستەوبەجێ دەستی کرد بە داڕشتنی پلانەکەی.

بەشمیتی ڕەشی بەرداری لە ژێر بالیفەکەی دەرهێنا. نایە بن باخەڵی و چوو بۆ لای هاوڕێکانی لە ژوورەکەی ئەو بەری دالانەکە. دەرگای دەرەوەی دالانەکە کرابۆوە. هەر کە پێی نایە نێو دالانەکەوە هەوای فێنکی مانگەشەو و شنەی شێداری شەوبای نێوەشەو لە دەموچاوی دا. چریکەی بولبولەکانی نێو باخی ماڵەکە گوێچکە و هەستی لاواندەوە.

کاتێک لە دالانەکە تێپەڕی و دەرگای ژووری هاوڕێکانی کردەوە، ژوورەکە ڕووناک نەبوو، بەڵام تریفەی تەربیعی یەکەم لە پەنجەرەکەوە دەهاتە ژوورێ. لە بەریکی ژوورەکە مێزێک و چوار

کورسی داندرابوون. چوار کەس لە هاوڕێکانی لە سەر مافوورەی تەرکی هۆدەکە ڕاکشابوون و عەباکانیان بە خۆیاندادابوو. خەنیفە لە دەرەوە لای ئەسپەکان خەوتبوو. گەمزالۆ بە بیستنی تەقەی دەرگاکە ڕاپەڕی. کە چاوی بە حاجی مراد کەوت ناسییەوە. دیسان ڕاکشایەوە. ئیلدار کە لە پاڵ ئەو دا ڕاکشا بوو، لە ڕێوە هەستا بەشمتیەکەی لە بەر کرد و چاوەڕوانی فەرمانی مورشیدەکەی ڕاوەستا. خان محەمەد و قوربان هەروا لە خەودا بوون. حاجی مراد ئەو بەشمیتەی پێی بوو لە سەر مێزەکە داینا و خرنیگەی هات. خرینگەکەش هی ئەو دراوە ئاڵتوونانە بوو کە بە بەری بەشمیتەکەیەوە دروو بوو. حاجی مراد دراوە ئاڵتوونەکانی کە ئەو ڕۆژە وەریگرتبوو دای بە ئیلدار و گوتی: «هانێ ئەوانەشی پێوە بدروو.» ئیلدار بەشمیت و دراوەکانی لێ وەرگرت. خێرا چوو بۆ بەر پەنجەرەکە و لە بەر تریفەی زێوینی مانگ چەقۆیەکی چکۆڵەی لە ژێر کالانی خەنجەرەکەی دەرهێنا، بەری بەشمیتەکەی کون کرد، دراوەکانی تێخست و دەستی کرد بە دروونی. کەمزالۆ هەستا و چوار مەشقی دانیشت. حاجی مراد گوتی: «گەمزالۆ! هەستن تفەنگ و شەشلوولەکان و فیشەک و تەقەمەنی ئامادە بکەن. سبەینێ ڕێگایەکی دوورمان لەبەرە.»

گەمزالۆ لەوەڵامدا گوتی: «گوللەشمان هەیە و باڕووتیش. هەر ئێستا هەمووی ئامادە دەکەین.» دەیزانی بۆ چی حاجی مراد دەڵێ تفەنگەکان پڕکەن. لە بەر خۆیەوە گوراندی و بزەیەک نیشتە سەر لێوی. لە سەرەتاوە ئەو تەنیا ئاواتێکی هەبوو: هەتا ئەو جێیەی دەتوانێ و لە دەستی دێ ئەو سەگە ڕووسییانە بکووژێ و بە خەنجەر هەڵیاندرێ و ڕوو بکاتەوە کوێستان. ئێستا کە بۆی

دەرکەوتبوو حاجی مرادیش دەیهەوێ ئەو کارە بکات، شاد و دڵخۆش بوو.

دوای ڕۆیشتنی حاجی مراد، گەمزالۆ هاوڕێکانی لە خەو هەستاند. هەر چواریان دەستیان کرد بە پڕکردنی تفەنگ و شەشلوول و ئامادە کردنی فیسقوفلاسقی تایبەتی و سازوبەرگی جەنگی. ئەو چەکوچۆڵ و لەتکانەی چەپڵەک بووبوون، هەموویان گۆڕی و باڕووتی تازەیان کردە نێو ئاگردانی تفەنگەکانەوە؛ گوللەکانیان لە تیتۆڵە پەڕۆی چەور پێچا و بۆ هەر فیشەکێک بە ڕادەی پێویست باڕووتی تازەیان تێکرد و فیشەکەکانیان پڕ کرد. شمشێر و خەنجەرەکانیان چەور کرد و تیغەکانیان تیژ کردەوە.

بەر لە هەڵاتنی خۆر حاجی مراد دیسان هات بۆ داڵانەکە و مەسینەیەکی پڕ کرد لە ئاو بۆ دەستنوێژ گرتن. چریکە و ورینگەی بولبولەکان لەو بەرەبەیانە فێنکە دا وڵاتی داگرتبوو و شادیی بە دڵان دەبەخشی. لە ژووری هاوڕێکانییەوە خشە و کرەکرەی زوورە و سێسوو دەهات و دیار بوو خەریکی تیژ کردنەوەی خەنجەر و شمشێرەکانن. حاجی مراد مەسینەکەی پڕ کرد لە ئاو هێشتا نەگەیشتبووە ژوورەکەی خۆی جگە لە خشەخشی زوورە و سێسوو، دەنگی نەرم و لە سەرەخۆی خەنیفەی هاتە گوێ کە لە بەر خۆیەوە گۆڕانیی دەگوت. ڕاوەستا و گوێی بۆ شل کرد. باسی داستانی ئازایەتیی کەسێکی دەکرد بەناوی هەمزە کە لەگەڵ هاوڕێکانی ڕەوەیەک ئەسپی ڕووسەکان ڕادەدا و کاتێک ئەو هەواڵە بە شازادەی ڕووسی دەگا، بە هێزێکی زۆرەوە دەکەونە شوێنیان و بە نێو لێڕەوارێکدا تێدەپەڕن، بەڵام بە داخەوە لەو بەری ڕووباری تەرەک گەمارۆیان دەدەن. گۆرانییەکە باسی چۆنییەتی شەڕەکە و ئازایەتیی

هەمزەی دەکرد کە چۆن ئەسپەکان دەکووژێ و بە جەندەکەکانیان مەتەرێز بۆ خۆی و هاوڕێکانی دروست دەکات. هەمزە و هاوڕێکانی هەتا دوایین فیشەک شەڕ دەکەن و پاشان دەست بە خەنجەر ئاوقای هێزەکانی ڕووس دەبن و دەبێتە شەڕی دەستەویەخە. هەمزە بەر لەوەی گیانی لە دەست بدات چەند مراوی بە ئاسمانەوە دەبینێ و ڕووی دەمی دەکاتە ئەوان و دەڵێ:

ئەی باڵدارەکان،، بفڕن، بفڕن
بەرەو ماڵەکانی ئێمە باڵ لێبدەن!
بڕۆن بە دایک و خوشکان و کچانی
ڕووسوورمان بڵێن
ئێمە لە ڕێگای سەربەرزیی نیشتماندا
خەباتمان کرد و شەهید بووین.
پێیان بڵێن تەرمەکەشمان لە نێو گۆڕدا
هەدا نادا و قەت ناخەوێ
گورگ و چەقەڵ جەرگ و دڵمان هەڵدەدڕن و
داڵ و سیارک و قشقەڕە گلێنەمان هەڵدەکۆڵن.
بەڵام ئێمە قەت نامرین، قەت نامرین...

ئەم گۆرانییە بە هەوایەکی خەمناک و دڵتەزێن کۆتایی دەهات و باتا بە دەنگە بە هێزەکەی لەگەڵی دەگوتەوە و بە لاالەالاللە و هاوار و بانگ تەواو دەبوو.

دیسان بێدەنگی. هیچ دەنگێک نەدەهات جگە لە ورینگەی بولبولان و خشەی لێک ساوینی بەرد و پۆلا.

حاجی مراد وەها کەوتبووە گۆمی بیر و خەیاڵەوە نەیدەزانی مەسینەکەی خوار کردۆتەوە و هەموو ئاوەکەی ڕژاوە. بۆ لۆمە

کردنـی خـۆی سـەری ڕاوەشـاند و دیسـان گەڕایەوە بـۆ ژوورەکەی. دوای نوێژی بەیانی تفەنگەکەی هێنا، بە وردی چاوی لێکرد و تاقیی کردەوە. پاشـان چـوو لە سـەر تەختەکە دانیشت. هـیچ کاریکی تـری نەبوو بیکات. بۆ ئەوەی بڕوات بۆ ئەسپ سواری دەبوو مۆڵەت لە ئەفسـەری بەرپـرس وەرگـرێ. هێشـتا هەوا ڕوون نەبووبـۆوە و ئەفسەری کێشک لە خەو هەڵنەستابوو.

گۆرانییەکەی خەنیفە ئەو شیعرەی وەبیر هێنایەوە کە دایکی دوای لە دایـک بـوونی ئەو هۆنیبـوویەوە و بە هەوای لایە لایە دەیگـوت. گۆرانییەکە بۆ باوکی حاجی مراد بوو و زۆر جار لە دایکی بیستبوو؛ ئەو گۆرانییەی کە بۆ لۆریس ملیکۆڤی گوتبوو.

ئێستا دەتگوت دایکی لە بەر چاویەتی؛ بەڵام نەک وەکوو دوایین جار بە دەموچاوی چرچولۆچ و سەری سپی و دەمی بێ ددانەوە، بەڵکوو جحێڵ و شۆخوشەنگ و توندوتۆڵ؛ هێندە بە هێز و توندوتۆڵ بوو تەنانەت ئەو کاتەی ئەم منداڵێکی شەش ساڵانی قورس و پەل قەویش بوو بە کۆڵیدا دەبەست و بە کوێستاندا هەڵدەگەڕا و دەیبرد بـۆ لای باوەگەورەی. بیرەوەری منداڵی، ئەوی خستە بیری کوڕە خۆشەویستەکەی، ئەو کاتەی بۆ یەکەم جار بە دەستی خۆی سەری بـۆ تاشـیبوو. ئێستا یۆسفی کوڕی گەنجێکی ئازا و بەجەرگ بـوو. ئەوی بەو جۆرە هاتە بەر چاو کە بۆ دایین جار دیتبووی:

ئەو ڕۆژەی لە ( تسـلمیس) هـاتە دەرێ. یۆسـف ئەسـپەکەی بـۆ هێنابووە دەرێ و داوای لێکردبوو ڕێگەی پێبدات لەگەڵی بچێ. یۆسف گورج و ئامادە و چەک لە شان هەوساری ئەسپەکەی بە دەستەوە گرتبوو. دەموچاوی جوان و سوورهەڵگەڕاوی جوامێری و ئازایەتیی لێ دەباری، قەڵافەتی باریکەڵە و لەباری، هێندێک لە باوکی کەڵەگەتتر

بـوو. حـاجی مـراد هەمـوو ئەوانەی هێنـابووە بەر چـاوی خـۆی و لە تاوی بنەماڵەکەی ئۆقرەی لێهەڵگیرابـوو. حـاجی مـراد ڕۆح و گیـانی لە لای کوڕەکەی بوو و کاتێک دەیدی سـەرەڕای تەمەنـی کەم، گەنجێکـی بەهێـزە و نێوشـانی پـان و نێـوقەدی بـاریکی و باسـک و بـاهۆی بە هێـزی و هەڵسـوکەوتی چالاکـانەی دەهێنـایەوە بەر چـاوی خـۆی، لە خۆشیانا گەزگەز بالای دەکرد.

حاجی مراد گوتبووی: «واباشترە تۆ هەر لێرە بمێنییەوە. تۆ ئێسـتا تەنیا پیاوی ماڵێی. دەبێ ئاگات لە دایکت و دایە گەورەت بێ.»

وەبیـری هـاتەوە یۆسـف بە سـەر بەرزانە و بە بزەیەکـی پـڕ لە ڕەزایەتەوە وەڵامـی دابـۆوە هەتـا ئەو کـاتەی زینـدوو بـێ هـیچ کەس ناتوانێ ئـازار بە دایکی و دایەگەورەی بگەیێنـێ. لەگەڵ ئەوەشـدا هەتـا قەراغ چـۆمی بە سـواری ئەسـپ بـاوکی بەڕێ کـرد و لەوێ گەڕایەوە. لەو کاتەوە ئیتر حاجی مراد دایکی و ژنەکانی و کوڕەکەی نەدیتبوو. ئێسـتا شـامیل هەڕەشـەی دەکـرد چـاوی یۆسـفی کـوڕی دەردەهێنـێ. سـەبارەت بە ژنەکانیشـی چیـان بەسـەردێ و چ بێڕێزییەکیـان پـێ دەکرێ، نەیدەویست بیر بکاتەوە.

ئەو بیـر و خەیـالانە وەهـای تووشـی خەم و دڵەڕاوکـێ کردبـوو ئاراوقارای لێهەڵگیرا بوو. بە پەلە هەستایە سـەر پێ و بە شەلەشـەل ڕۆیشـت بـۆ بەر دەرگـاکە و ئیلـداری بانـگ کـرد. هێشـتا خـۆر هەڵنەهـاتبوو، بەلام هەوا بە تەواوی ڕوونـاک بووبـۆوە. بولبەلەکـان هەروا دەیـان چریکانـد. گـوتی: «بچـۆ بە ئەفسـەری کێشـک بڵـێ دەمهەوێ بچم بۆ ئەسپ سواری. ئەسپەکانیش زین بکەن.»

# بیست و چوار

لە هەمــوو ئەو مــاوەیەدا فیکــر و زیکــری بــووتلێر لە لای شــیعری خەبـاتگێڕان بـوو. لە بەر خـۆیەوە ویرەویـری دەهـات و ئەو شـیعرانەی دەگـوت. نەک لە کـاتی دەوامـدا بەڵکـوو لە ژیـانی تـایبەتی ڕۆژانەشـدا هەروا لە ســەر لێـوی بـوو. جلـوبەرگی چەرکەســی لە بەر دەکـرد. بە ئەسپ تەڕاتێنی دەکرد و ئەو شیعر و ئاوازانەی دەگوتەوە. دوو جار لە هەڵمەتـی شـەوانەی بۆگدانۆڤیچـدا[90] بەشـداریی کـرد، بەڵام نە کەسـێکی کوشـت و نەکەسێکیشـی دەسـتگیر کـرد. نزیکـی و دۆسـتایەتیی لەگەڵ بۆگدانۆڤیچ شـانازییەکی گەورە بـوو، چـونکە ئەفسـەرێکی زۆر بەجەرگ و چاونەترس بـوو. ئەو دۆسـتایەتییە وەرەی پـێ دەبەخشـی. قەرزەکەی بۆ دابـۆوە. بە بەهرەیەکـی زۆر قەرزی لە جـوولەکەیەکی سـووت خـۆر وەرگرتبوو. لە ڕاسـتیدا کێشـەکەی چارەسـەر نەکرابوو، تەنیـا مـاوەیەک وەدوا خرابوو. نەیدەویست بیر لە بارودۆخی خـۆی بکـاتەوە. بـۆ لە بیـر بـردنەوەی خەم و کێشـەکانی تەنیـا پەنـای بـۆ چڕینـی شـیعر و ئـاوازی خەبـاتگێڕانە نەدەبـرد، مەشرووبیشــی دەخـواردەوە. ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ لە بــاری ئاکـــار و ڕەفتـــارەوە کەســـایەتیی دادەبەزی و لە بەر چـــاوی دەوروبەرییەکـانی سـووک دەبـوو. ئیتر ئەو یۆسـفە داوێنپـاکە نەبـوو کە گرنگی بە ماریا دیمتیری یۆڤنای زڵەیخا شێوە نەدات و خـۆ لە ئەشـق و هەوەس ببــــــوێرێ. بە پــــــێچەوانە زۆر بــــــێ شــــــــەرمانە و بە ڕووهەڵماڵـداروییەکی ئاشـکراوە دەیویسـت لە خشـتەی بەرێـت، بەڵام

---

90- Bogdanovich

وەهـا تونـد و ڕاشـكاوانە ماريـا دەسـتی بەڕوويەوە نـا، لەگەڵ ئەوەی تووشی سەرسووڕمان بوو، هەستی بە شەرمەزاريش كرد.

لە كۆتـايی مـانگی ئاڤريلـدا تاقمێـك ئەفسـەر و سـەرباز كە دوو مەفرەزە لە ليوای كابارادا بوون هـاتن بۆ قەڵا. بارياتينسكی دەيويست بەيارمەتيی ئەو هێزانە هەمـوو خـاكی چيچێن داگيـر بكـات، كارێك كە هەتا ئەو كاتە مەحاڵ بوو. بە پێی داب و نەريتی قەفقاز ئەوانە ميوانی ليواكانی كوورين بوون. سەربازەكانيان لە سـەربازخانە نيشـتەجی كرد و جـگە لە ئاشـی گەنـمە ڕەشـە، گۆشـت و ڤۆدكاشـيان پێـدەدان. ئەفسـەرەكانيش لەگەڵ ئەفسـەرەكانی دانيشـتووی كـوورين بـوونە هاومەنزڵ. بۆ ڕێزگرتن لە ميوانەكان ميوانييەكی گەورەيان بەڕێوە برد و بەزم و گـۆرانی و بادەنۆشـی گەرموگـوڕ و شـاهانە بـوو. عەميـد پێترۆڤ هێندە مەست بوو هۆشی لە لا نەمابوو. بە ڕەنگی بزركاوەوە لە سەر كورسييەكە تخێڵ بووبوو. شمشێرەكەی لە كالان دەركێشابوو، هێرشی دەكردە سەر دوژمنێكی خەياڵی و جنێوی دەدا و پێدەكەنی. جاروبار يەكێكی لە باوەش دەگرت و دواتر بە هەوای گۆرانييەك كە حەزی پێدەكرد، دەستی دەكرد بە سەما و هەڵپەڕكێ:

شاميل شۆڕشی كردووە
لە ساڵانی ڕابردوودا
دەلەی لەلەی،لەلەی لەی
لە ساڵانی ڕابردوودا...

بووتلێريش لەوێ بوو. دەيويست لەو كۆڕەشدا وەک خەباتگێڕێكی بەجەرگ هەڵسوكەوت بكات. بەڕاستی بەزەيی بە عەميددا دەهات، بەڵام هيچی لە دەست نەدەهات. كە ديتی سەرخۆشی خەريكە ئەويش لە پێ بخات، دەرەدزەی دايە و بە هێواشی لە كۆڕەكە چووەدەرێ.

مانگی چارده، ماڵەکان و سەنگفەڕشی کۆڵان و شەقامی سپی هەڵگێڕا بوو. هێندە ڕووناک بوو دەتتوانی زەنگیانەی لە بەر بگریەوە، خیز و گەڵا و پەلەپووش و چاڵوچۆڵی کۆڵان هەمووی مەعلووم بوو. لە نزیک ماڵێ چاوی بە ماریا کەوت شاڵێکی لە سەر و ملی هاڵاند بوو. دوای ئەو سارد و سڕی و بێ مەیلییەی پێوەی دیبوو، بووتلێر بە شەرمەزارییەوە ڕووی لێ وەردەگێڕا و خۆی لێ بە دوور دەگرت. بەڵام لەو مانگەشەوە خۆشەدا و لەو پەڕی مەستیدا، بە دتینی ماریا گەشایەوە و ویستی دیسان خۆی لێ نزیک بکاتەوە.

لێی پرسی: «دەچی بۆ کوێ؟»

ماریا بە مێهرەبانییەوە وەڵامی دایەوە: «دەچم بزانم پیرەپیاو حاڵی چۆنە.»

ماریا ڕاست و ڕاشکاوانە لەگەڵ بووتلێر دەدوا، بەڵام کە دەیدی ماوەیەکە ئەو خۆی لێ دەبوێرێ و دوورەپەرێزیی لێدەکات، هێندێک دڵی لێی ڕەنجا بوو.

«خەمت نەبێ. زوو دێتەوە بۆ ماڵێ.»

«دەتوانێ؟»

«ئەگەر بە پێی خۆشی نەتوانێ بێتەوە، دەیهێننەوە.»

«هەروایە. بەباشی نازانم بچم بۆ لای. وانییە؟»

«بەڵێ، واباشترە نەچی، وەرە بابڕۆینەوە بۆ ماڵێ.»

ماریا دیمتیری یۆڤنا گەڕایەوە. بەرەو ماڵێ وەڕێ کەوتن. مانگەشەو هێندە ڕووناک بوو دەتگوت خەرمانەیەک تریفە دەوری سێبەرەکەی ئەوانی داوە. بووتلێر چاوی لەو تریفە ڕووناکەی مانگ دەکرد و دەیویست بە ماریا بڵێ ئەشق و خۆشەویستیی ئەو هەروا لە دڵیدایە، بەڵام نەیدەزانی چۆنی بدرکێنێ و لە کوێوە دەست پێبکات. ژنە

چاوەڕوان بوو بووتلێر قسە بکات. بەو شێوەیە هەنگاویان دەنا و هیچیان متەقیان نەدەکرد. گەیشتبوونە نزیک ماڵێ، چاویان بە چەند ئەسپ سوار کەوت بەرە و کۆڵانەکە بایان دایەوە، ئەفسەرێک بوو بە چەند سەربازەوە.

ماریا دیمتیری یۆڤنا خۆی کێشا دواوە و گوتی: «ئەوە کێیە بەرەو ئێرە دێ؟» مانگ لە پشت سەری سوارەکەوە تریفەی دادەباراند. ماریا نەیناسییەوە هەتا گەیشتنە پەنایان. کامینێڤ[91] بوو؛ ئەفسەرێک کە پێشتر هاوکاری عەمید بوو، هەر بۆیە ماریا ئەوی دەناسی.

ماریا سەری هەڵبڕی و گوتی: «پیتێرنیکۆلاییڤیچ[92] ئەوە تۆی؟»

وەڵامی دایەوە: «بەڵێ خۆمم. بووتلێر ئەوە تۆی؟ هێشتا نەخەوتووی؟ لەگەڵ ماریا دیمتیری یۆڤنا پیاسە دەکەن؟ واباشە وریابی و پێی زیادی دانەکیشی، دەنا عەمید پێت دەڵێ پووتێک چەند سیەیە! ئەی عەمید لە کوێیە؟»

ماریا سەری بۆ لای دەنگی بەزم و گۆرانییەکە سووڕاند و گوتی: «خەرکی بادە نۆشییە!»

«چی بووە؟ بە چ بۆنەیەکەوە ئەو بەزمەیان ساز کردووە؟»

«چەند کەس لە ئەفسەرانی هەساڤ ـ یوورت[93] هاتبوون. میوانییەکە بۆ ئەوان گیراوە.»

«چەندە باش و لە کاتی خۆیدا گەیشتم. هێندێک ئیشم بە عەمیدە.»

بووتلێر لێی پرسی: «ئیشی فەرمی؟»

«کەم تا کورتێ.»

---

91- Peter Nikolaevich
92- Hasav Yurt
93- Chikhirev

«چاک یان خراپ؟»

کامینێڤ پێکەنی و گوتی: «فەرق ناکا؛ بۆ ئێمە باشە و بۆ هێندکەیش خراپ.»

ئێستا گەیشتبوونە ماڵی عەمید. کامینێڤ گوڕاندی بە سەر یەکێک لە کازاخەکاندا: «چیخیرنیریڤ[٩٤] وەرە بۆ ئێرە.»

یەکێک لە کازاخەکان هاتە پێشێ. یۆنیۆرمی ئاسایی کازاخەکانی دۆنی لە بەردا و چەکمەی مل درێژی لە پێدا بوو. توربێنێکیشی بە دەستەوە بوو.

کامینێڤ لە کاتی دابەزیندا گوتی: «دەری هێنە.»

کازاخەکە دابەزی. کیسەیەکی لە خورجێنەکەی دەرهێنا. کامینێڤ کیسەکەی لێ وەرگرت. دەستیی کرد بە نێو کیسەکەدا و گوتی: «ماریا دیمیتری یۆڤنا ناترسی؟»

ماریا وەڵامی دایەوە: «لە چی بترسم؟»

کامینێڤ سەری بڕاوی مرۆڤێکی لە کیسەکە دەرهێنا. لە بەر تریفەی مانگەشەو پیشانیدا. « کەوایە بڕوانە بزانم دەیناسییەوە؟»

سەرێکی تاشراو بوو بە جووتێ برۆی پڕ و ڕیش و سمێڵی کورت و ڕەشەوە؛ یەکێک لە چاوەکانی زەق و ئەوی دیکەیان نیوە قووچاو بوو. تەپلی سەری بریندار بوو برینەکەی دەمی کردبۆوە. لووتی خوێنی پێوە دەڵەمە بووبوو. خاولییەکی خوێناوییان لە ملی پێچابوو. سەرەڕای برینی زۆری دەموچاوی، بزەیەکی مێهرەبان و منداڵانەی لە سەر لێو بوو.

---

94- Don

ماریا دیمیتری یۆڤنا چاوی لێکرد. بەبێ ئەوەی زمانی بگەڕێ ڕووی وەرگێڕا و بە پەلە خۆی کرد بەماڵیدا.

بووتلێر نەیدەتوانی چاو لە سەر ئەو سەرە بڕاوە سامناکە هەڵگرێ: سەری حاجی مراد بوو، ئەو پیاوە خەباتگێڕەی ماوەیەک لەمەو بەر شەوانێکی زۆر پێکەوە دانیشتبوون و قسەیان کرد بوو.

کامینێڤ گوتی: «دەیویست ڕابکات، بەڵام گرتمانەوە.» کەللە سەرەکەی دایەوە بە کازاخەکە و لەگەڵ بووتلێر چوونە ژووری.

کامینێڤ گوتی: «زۆر قارمانانە گیانی لە دەست دا.»

«بەڵام بۆ کوژرا؟ چی ڕووی دا؟»

هێندێک سەبرکە. عەمید بێت هەموو ڕووداوەکەتان بە وردی بۆ دەگێڕمەوە. دەبێ ئەو کەللەسەرە بە هەموو قەڵا و گوند و شارەکاندا بگێڕین!»

ناردیان بە دوای عەمیددا. عەمید لەگەڵ دوو ئەفسەری تر کە ئەوانیش وەک خۆی بەدمەست بوون، هاتەوە. کامینێڤی لە ئامێز گرت و بەخێر هاتنی کرد.

کامینێڤ گوتی: «سەری حاجی مرادم بۆ هێناوی.»

«نا! شتی وا نەڵێی کوژرا!»

«بەڵێ، دەیویست ڕابکات.»

«هەمیشە دەمگوت فێڵێکی لە ژێر سەردایە و ئەو هاتنەی بە ڕاستی نییە. کوا؟ سەری کوا! پیشانم بدە.»

بانگی کازاخەکەیان کرد. کیسەکەی هێنا. عەمید بە چاوی مەستەوە ماوەیەک تێی ڕاما.

«لەگەڵ ئەوەشدا پیاوێکی ئازا و بە شەرەف بوو. دەمهەوێ ماچی بکەم.»

یەکێک لە ئەفسەرەکان گوتی: «بەڵێ، بەڕاستی پیاوێکی بەجەرگ و چاونەترس بوو.»

دوای ئەوەی هەمووان چاویان لە کەللەسەرەکە کرد، دایانەوە بە کازاخەکە. ئەویش خستییەوە نێو توورەکە کە و بە هێواشی لە سووچێک داینا.

ئەفسەرەکە پرسیاری کرد: «جەنابی کامینێڤ ئەو سەرە پیشان دەدەی، وتاریش پێشکەش دەکەی؟»

عەمید دەنگی هەڵبڕی: «نا، لێم گەڕێن بامباچی بکەم. ئەو شمشێرێکی بە دیاری دابەمن.»

بووتلێر چووە دەرێ، لەبەر هەیوانەکە ڕاوەستا.

ماریا دیمیتری یۆڤنا لە سەر پلیکانی دووهەم دایشتبوو. ڕووی کردە بووتلێر و بە تووڕەیی سەری هەڵێنا. بووتلێر لێی پرسی: «ماریا دیمیتری یۆڤنا، چی بووە؟»

«ئێوە پیاو کوژن... ئێوە دڵڕەق و خوێنڕژنژن... ڕقم لێتانە و نامهەوێ بتانبینم... ئێوە پیاو کوژن!»

بووتلێر نەیدەزانی بڵێ چی؛ گوتی: «ئەوە بەڵایەکە لەوانەیە هەموو کەس بە سەری بێ. شەڕ ئەوەیە ئیتر!»

ماریا بەگریانەوە دەنگی هەڵبڕی: «شەڕ! ئەوە چ شەڕێکە؟ ئەوە قەسابییە! تەرمی مردوو دەبێ بە خاکی بسپێرن، نەک ئاوا بیکەنە مەڵحەکە. پیاوکوژانە! پیاوکوژانە!» بە دەم گریان و شەپۆرەوە لە دەرگای پشتەوە چووە ژوورێ.

بووتلێر گەڕاوە بۆ هۆدەکە و داوای لە کامینێڤ کرد چۆینەتیی ڕووداوەکەیان بۆ بگێڕێتەوە

کامینێڤ گوتی:

ڕووداوەکە بەم شێوەیە بوو:

## بیست و پێنج

حـــاجی مـــراد ڕێـــگەی ئەوەی پێـــدرابوو بە ســـواری لە دەوروبەری شـــار بســـووڕێتەوە، بەڵام هەمیشـــە گـــورووپێکی کـازاخی لەگەڵـدا بـوو. سـەرجەمی ئەو سـەربازانەی لە نووخـا خزمەتیـان دەکـرد بیسـت کەس بـوون، دە کەسـیان پـارێزەری حـــاجی مـــراد بـــوون و دە کەســـەکەی دیـــکەش خزمەتکـــاری ئەفسەرەکان بوون. کەوای بە پێی ئەو فەرمانەی پێمان کرابوو، ئەگەر لانیکەم دە سەربازمان بکردایەتە پارێزەری حاجی مراد، دەبوو ئەو دە کەسە هەموو ڕۆژێ لەگەڵیدا بن. هەر بۆیە دوای چەنـد ڕۆژ مـانەوەی لە نووخـا، بڕیـار درا لەوە بەدواوە تەنیـا پێنج کەس پارێزەری بن و لەگەڵیدا بچن. داوا حاجی مرادیش کـرا هـیچ کـات هەمـوو هاوڕێکـانی لەگەڵ خـۆی نەبـات. بەڵام ڕۆژی بیسـت و پێنجەمـی ئاڤریـل، حـاجی مـراد لەگەڵ هەر پێنج هـــاوڕێکەی وەڕێـــکەوت. کاتێـــک ویســـتی بـــڕوات، ئەفســـەری فەرماندە پێی ڕاگەیاند کە نابێ هەموو هاوڕێکانی لەگەڵ خۆی ببات. حاجی مراد وای نواند گوێی لێ نەبووە و ملی ڕێی گرت. ئەفسەریش ئیتر پێداگریی نەکرد.

ئەفسەرێک بە ناوی نازارۆڤ[95] فەرماندەی سەربازەکان بوو، چەن کەڕەت نیشانی قارەمانێتیی وەرگرتبوو. لاوێکی بەهێز و مووخورمـایی و گورجرگـوڵ و زیـرەک بـوو. ئەو نـۆبەرەی بنەماڵەیەکی هەژار و دەستکورت بوو. باوکی کۆچی دوایی کرد بـوو و دایـکە پیـرەکەی و سـێ خوشـک و دوو بـرای بەخێـو دەکرد.

ئەفسەری فەرماندە گوتی: «نازارۆڤ چاوێکت بکە چوار چاو و وریابە. لە بیرت نەچێ زۆر وریابە!»

نازارۆڤ لە وەڵامدا گوتی: «بە چاوان گەورەم!»

پێی نایە سەر ڕکێف، تفەنگەکەی لە شانی کرد و لە سەر ماڵی زین دانیشت تفەنگەکەی بە شانییەوە ڕاستەوپاستە کرد و بە سواری ئەسپە شێی یاڵ بە ژەنگار و سینە بەرز و کەفەڵ پان دەستی کرد بە یۆرغە و وەڕێ کەوت. چوار کازاخ لەگەڵی ڕۆیشتن: فیرایۆنتۆڤ[96] کەڵەگەت و بەلەباریکە و لە زاتی خۆیدا دز و دەسـتپیس؛ ئەو بـوو هێنـدێکی بـاڕووت بە گەمزالـۆ فرۆشـتبوو؛ ئیگنـانۆڤ[97] وەرزێڕێکـی گەڕاوەی بە توانـا بـوو، ئەگەر چی هێندەی نەما بوو خزمەتەکەی کۆتایی پێ بێ، بەڵام هێشـتا بەهێـزی شـان و بـاهۆی خـۆی دەنـازی؛ میشـکین[98]، گەنجێکـی لاواز و زەردڵ بـوو هەمـووان گاڵتەیـان پێـدەکرد و

95- Nazarov
96- Ferapontov
97- Ignatov
98- Mishkin

کڵاویـــان لە ســـەر دەنـــا؛ پتراکـــۆڤ[99] گەنجێکـــی قژکـــاڵی سەروڕووخۆش و دەم بە پێکەنین و تاقانە کوڕی دایکی بوو.

بەیانێکی فێنک بوو، تەمومژ وڵاتی داگرتبوو. پاشان تەمەکە ڕەوی و هەواکەی تاووســاو بــوو. مێــرگ و ســەوزەڵانییەکی بەربــڵاو، گژوگیــای تەڕ و تــازە، گەرمەشــانی تــازە ڕســکاو و ڕووبــاری پــڕ تەوژم و کەفچــڕێن کە بە لای ڕاســتی ڕێگــاکەدا هــاژەی دەهــات و دەیلرفانــد، هەمــوو لە ژێــر تیرێــژی خــۆردا دەدرەوشانەوە.

حــاجی مــراد ئــارام و لە ســەرەخۆ ئەســپەکەی دەئــاژوا. هاوڕێکانی و کازاخەکان بە دوایدا بە نەرمی دەڕۆیشتن. زۆر بە هێواشـــی لە ڕێگــاکەی ئەو بەری قەڵا تێــپەڕین. بە پــاڵ ئەو ژنانەدا ڕۆیشتن کە قەرتاڵەیان لە سەر سەریان دانابوو، چەند سەرباز عارە بانەیان لێدەخوڕی و چەند هێلینگەش گامێش و بارگین ڕایاندەکێشان. لەوان دوور کەوتنەوە. یەک میل و نێو ڕێگایان بڕی، حاجی مراد زەبرێکی هێواشی لە ئەسپەکەی دا و خێراییەکەی زیاتر کرد. هاوڕێکانی و کازاخەکان بۆ ئەوەی دوا نەکەون ناچار بوون ئەسپەکانیان بخەنە چوارناڵ.

فیراپۆنتۆڤ گوتی: «ئەسپەکەی زۆر ئەسپی چاکە. ئەگەر نەهاتبــایەتە پاڵمــان و دوژمنمــان بــوایە، دەمکــرد بە قوربــان گوللەیەک و ئەو ئەسپە بێ وێنەیەم هەڵدەگرت بۆ خۆم!»

«بەڵێ هاوڕێ. لە تفلیس سێسەد ڕۆبڵیان پێدا نەیفروشت.»

---

99- Petrakov

نازارۆڤ گوتی: «ئەگەر ئیشتیام لێ بێ بەو ئەسپەی خۆم وەپێشی دەکەوم.»

«وەپێشی دەکەوی؟ ئەوە خەیاڵ پڵاوە!»

حاجی مراد جار لەگەڵ جار خێراییەکەی زیاتر دەکرد. نازارۆڤ کە دەیویست بە حاجی مراد بگاتەوە دەنگی هەڵبڕی: «هاوڕێ هێواشتر؛ ئەوەندە خێرا مەڕۆ.»

حاجی مراد ئاوڕێکی دایەوە و هیچی نەگوت، خێراییەکەشی کەم نەکردەوە.

ئیگنانۆڤ گوتی: «وادیارە کارێکیان لە ژێر سەردایە! دیتووتە چەندە بە پڕتاو دەڕۆن!»

یەک میلی تر بەرە و کوێستان ڕێگایان بڕی.

نازارۆڤ دەنگی هەڵبڕی: «دەڵێم ئەوەندە بە پڕتاو مەڕۆ!»

حاجی مراد نە وەلامی دایەوە، نە ئاوڕی دایەوە. خێراییەکەشی زیاتر کرد. ئێستا بە چوار ناڵ دەڕۆیشت.

نازارۆڤ نەڕاندی: «نەگبەتی! ناهێڵم خۆت دەربازکەی.» قەمچییەکی لە ئەسپەکەی ڕاکێشا. لە سەر زینەکە هەستا، بەرەو پێشەوە داهاتەوە بەپڕتاو غاری دا بۆ ئەوەی پێی بگاتەوە.

هەواکەی زۆر ڕووناک و ساماڵ بوو، ژیانیش بە لای نازارۆڤەوە کە لەگەڵ ئەسپەکە بووبوونە یەک جەستە و وەک بای شەماڵ دەفڕی، هێندە جوان و ڕازاوە و پڕنەشە بوو، ڕووداوی کارساتێکی دڵتەزێن و خەماوی بە زەینیشیدا نەدەهات. لەوەی کە جار لەگەڵ جار لە حاجی مراد نزیکتر دەبۆوە، کەیفی دەکرد.

حاجی مراد به خرمەی سمی ئەسپەکەی دواوەیدا بۆی دەرکەوت خەریکە پێی بگاتەوە. بە دەستی ڕاستی شەشلوولەکەی دەرهێنا و بە دەستی چەپی هێندێک هەوساری ئەسپەکەی کێشا کە خرمەی سمی ئەسپەکەی دواوەی تووشی هەیەجانی کردبوو؛ نازارۆڤ بە حاجی مراد گەیشتبۆوە و لەگەڵ ئەوەی دەستی درێژ کردبوو و دەیویست هەوساری ئەسپەکەی حاجی مراد بگرێ، دەینەڕاند: «پێت دەڵێم نابێ...» بەر لەوەی دەستی بگاتە هەوساری ئەسپەکە شەشلوولەکەی دەستی حاجی مراد شریخەی لێوەهات. نازارۆڤ دەستی بە سینگییەوە گرت و هاواری کرد: «ئەوا چی دەکەی؟ کوڕینە بیانگرن!» نووشتایەوە و بە سینگەوە کەوتە سەر زینەکە.

هاوڕێیانی حاجی مراد چونکە لەوان خەباتگێڕتر و ئازاتر بوون دەستیان کرد بە تەقە کردن و بە شمشێرەوە هەڵیانکوتایە سەریان.

نازارۆڤ خۆی بە ملی ئەسپەکەیدا هەڵواسیبوو و ئەسپە خوودارەکەی بێ ئۆقرە هەڵدەسووڕا و بە دەوری خۆیدا دەخولایەوە. ئەسپەکەی ئیگناتۆڤیش گلا و هەر دوو لاقی شکا. دوو کەس لە چیانشینان بێ ئەوەی لە ئەسپەکانیان دابەزن ئیگناتۆڤیان دایە بەر زەبری شمشێر. پتراکۆڤ دەیویست بچێت بۆ یارمەتیی هاوقەتارەکانی، بەڵام بەر لەوەی بگاتە لایان دوو گولله لە پشت و لاقەبرغەی درا و وەک تەرمەکە گیا لە سەر ئەسپەکەی کەوتە خوارێ.

میشکین بە چوار ناڵ بەرەو قەڵا تێی‌تەقاند. خەنیفە و خان محەمەد کەوتنە دوای، بەڵام هێندە دوور کەوتبۆوە پێی

نەگەیشــنەوە. کە دیتیــان پێــی نــاگەنەوە، گەڕانەوە بــۆ لای هاوڕێکانیان.

پتراکۆڤ بە زگی هەڵدڕاوەوە لە سەر زەوی ڕەهێڵ بووبوو. ڕووی لە ئاسمان بوو و زاری داچاقاوی پڕ بووبوو لە خۆڵ و خوێن؛ وەک ماسیی لە ئاو دابڕاو دەمی بە یەکدا دەدا. گەمزالۆ کە بە شمشــێر حەیــاتی لە ئیلنــاتۆڤ بڕیبــوو، زەبرێکیشــی لە نــازارۆڤ دا و لە ســەر ئەســپەکەوە خســتیە خــوارێ. خــان محەمــمەد کیســەی فیشــەکەکانی نــازارۆڤی هەڵگــرت. خەنــیفە دەیویسـت ئەسـپەکەی نـازارۆڤ بگـرێ، بـڵام لەو کـاتەدا حـاجی مـراد بـانگی کـرد. بە پڕتـاو ڕۆیشـتن و لە گۆڕەپـانی شـەڕەکە دوورکەتـنەوە. هەر پێـنج سـوارە چیانشـینەکە بە دوای حـاجی مــرادا بە چــوار نــاڵ دەڕۆیشــتن و ئەســپەکەی پتراکــۆڤ کە دەیویســـت لەگەڵیــان کەوێ بــۆ دواوە ڕایانــدا. گەیشـــتبوونە چەڵتوکجاڕەکانی نووخا و نزیکەی شەش میل لە قەڵاکە دوور کەوتبــوونەوە؛ تەقەیەک بە نیشــانەی ئامادەبــاش و لە ئــارادا بوونی مەترسی لە بورجی قەڵاکەی نووخاوە هات.

فەرماندەی قەڵا کە ئاگادار کرا حاجی مراد ڕایکردووە، هەر دوو دەسـتی بە لاجەســەریەوە گــرت و لە دڵــی خۆیــدا گــوتی: «خـودایە، خـودایە، خـودایە گیـان! دیتـت چ قـوڕێکم بە سەردا کرا؟» گوێی بۆ قسـەکانی میشـکین ڕاگرتبـوو و دەیگـوت: «ئەو ناکەسـانە هەڵیانخەڵەتانـدین!» لە هەمـوو لایەکەوە ئامـادە باشــیان ڕاگەیانــد. نەک هەمــوو کازاخەکــان، بەڵکــوو هەمــوو خەڵکانی سڤیلی لایەنگری ڕووسـەکان و گونـدەکانی ئەو دەڤەرە دەسـتیان دایە چەک و شمشـێر و کەوتـنە دوای حـاجی مـراد و

هاوڕێکانی. ڕایانگەیاند هەر کەسێک بتوانێ بە مردوویی یان بە زیندوویی حاجی مراد ڕادەست بکات هەزار ڕۆبڵ خەڵات دەکرێ. دوو سەعات دوای هەڵاتنی حاجی مراد و هاوڕێکانی زیاتر لە دووسەد کازاخ، بە چوار ناڵ بە دوای ئەفسەری فەرماندەدا غاریان دەدا بۆ ئەوەی بگەنە سەریان و دەستگیریان بکەن.

دوای چەند میل تاودان بە جادەی سەرەکیدا، حاجی مراد هەوساری ئەسپەکەی کێشا، کە لە تۆز و ئارەقەدا خووسا بوو و کەوتبووە هەناسە بڕکێ.

لە لای ڕاستی جادەکە، ماڵی گوندنشینان و منارەی بنردژیک[100] و لەو بەری دیکەشەوە کێڵگە و مەزرا، لەو لاتریشەوە ڕووبارێک وەبەر چاو دەکەوت. ئەگەرچی ڕێگای کوێستان لە لای دەستە ڕاست هەڵکەوتبوو، بەڵام حاجی مراد بە لای چەپدا بایدایەوە. دڵنیا بوو شوێنگێڕەکان بە لای ڕاستدا دەڕۆن، بەڵام ئەو دوور لە جادەکە، دوای تێپەڕین لە ڕێگایەکی نێوبڕی ئەو لای ئالازانەوە[101]، دەگەیشتە شوێنێک کە هیچ کەس چاوەڕوانی ئەوەی نەدەکرد. بە شانی ڕووبارەکەدا دادەگەڕا هەتا دەگەیشتە لێرەوارەکە، پاشان دوای پەڕینەوە لە ڕووبارەکە دەگەیشتنە کوێستان. بەپێی ئەو پلانە بە لای چەپدا ڕۆیشت.

بەڵام پەڕینەوە لە ڕووبارەکە مەحاڵ بوو. ئەو چەڵتوکجاڕانەی دەبوو پێیدا تێپەڕن، ئاویان لێنرا بوو و

---

100- Benerdzhik
101- Alazan

ئەسپەکان هەتا چۆکیان تێدەچەقی. بۆیە حاجی مراد و هاوڕێکانی ناچار بوون جارێک بە لای ڕاستدا و جارێک بە لای چەپدا بڕۆن بۆ ئەوەی زەوییەکی وشکتر بدۆزنەوە. بەڵام تەواوی چەڵتووجارەکان ئاویان لێنرا بوو و دەتگوت هەموو ئاوی ڕووبارەکەیان لەو دەشتە ئاژین کردووە.

ئەسپەکان کاتێک لاقیان لە قوڕەکە دەچەقی و دەریان دەهێنایەوە تلّپەی دەهات و دەتگوت چێوپەمۆ لە سەری بەتلّێک دەرێنی. ناچار بوون چەند هەنگاو بڕۆنە پێشێ و ڕاوەستن بۆ ئەوەی ئەسپەکان پشوو بدەن. وەها لەو قوڕ و زیلافەیەدا گیریان کرد، هەوا تاریک داهات و ئەوان هێشتا نەگەیشتبوونە ڕووبارەکە. لای دەستە چەپیان زەوییەکەی بەرزتر و پڕ لە بنچک و دەون بوو. حاجی مراد بڕیاری دا بچێتە ئەو شوێنە، شەوێ لەوی بمێننەوە و ئەسپەکانیش پشوو بدەن و بلەوەڕێن. هاوڕێکانی نان و پەنیریان دەرهێنا و ملیان نا لە خواردن. وڵات تاریک داهات. سەرەتا مانگ لە لای ڕۆژاواوە هێندێک تریفەی دابارند، بەڵام زۆر زوو ئاوا بوو و تاریکی باڵی بە سەر دەشت و کێو و ڕووباردا کێشا. لە نێو بنچک و دەونەدکاندا بولبول ورنیگەیان دەهات. دوو بولبول لە نزیک ئەوان لە نێو دەوەنیکدا بوون. تا ئەو کاتەی حاجی مراد و هاوڕێکانی دەنگیان دەهات ئەوان بێدەنگ بوون، بەڵام کاتێک ئەوان ڕاکشان و هەست و خوستیان لە خۆیان بڕی، بولبولەکان کەوتنە سەر بەزمی خۆیان و ئەویندارانە دەیانچریکاند و بۆ یەکتریان دەساندەوە.

حاجی مراد گوێی بۆ هەموو دەنگ و چرپە و خشپەیەک شل کرد بوو، دەنگی بولبولەکان سەرنجی ڕاکێشا و ئەو ئاوازەی

هەمزە کەوتەوە یادی کە شەوی ڕابردوو کاتی دەسنوێژ گرتن وەبیری هاتبۆوە. بە خەیاڵیدا هات کە ئەویش تووشی ئەو چارەنووسە دەبێت. لە ناکاو ورەی هاتەوە بەر و هەستا عەباکەی ڕاخست و نوێژی دابەست. هێشتا سلاوی نوێژەکەی نەدابۆوە هەستی بە خشپەیەک کرد؛ بۆی دەرکەوت خشپەکە لێیان نزیک دەبێتەوە. جگە لە خشپەکە جلقەی پێی ئەسپش دەهات کە بە نێو چەڵتووکجاڕە ئاو لێنراوەکەدا دەڕۆیشتن.

خان محەممەدی چاوتیژ و وریا چوو بۆ قەراغ دەوەنەکان. لەو تاریکییەدا چەند تارمایی و تاپۆی دی: چەند کەس بە سوارە و پیادە دەهاتنە پێشێ. خەنیفەش، لەو لایەی دیکەوە چەند تارمایی چاوپێکەوت: کارگانۆف[102] فەرماندەی ناوچەکە بوو لەگەڵ هێزەکانی.

حاجی مراد بیری کردەوە: «زۆر باشە. ئێمەش وەک هەمزە بەربەرەکانی دەکەین و هەتا دوایین پشوو شەڕ دەکەین.»

دوای ئەوەی بۆیان دەرکەوت حاجی مراد ڕایکردووە، فەرمانی شوێن هەڵگرتنی دەرکرا. کارگانۆڤلەگەڵ تاقمێک کازاخ و چەکداری ڕەشۆکی کەوتنە شوێنی، بەڵام هیچ شوێن پێیەکیان بۆ نەدۆزرایەوە. لای عەسر شەکەت و هیوا بڕاو، دەیانویست بگەڕێنەوە، چاوی بە پیرەپیاوێک کەوتبوو و لێی پرسیبوو چەند سواری نەدیوە؟ پیرەپیاو لە وەڵامدا گوتبووی: بەڵێ دیتوومە؛ شەش سوار بوون لە نێو چەڵتووکجاڕەکەدا گیریان خواردبوو و سەریان لێ شێوابوو، پاشان ڕوویان کردە

102- Karganov

نێــو دەوەنجــاڕەکە، مــن هەمیشــە دەچــم لەوێ ئێزنــگ و ســووتەمەنی دەهێــنم. کارگــانۆڤلەگەڵ پیرەپیــاو گەڕایەوە. کە چــاوی بە گێزوگـوڵینگی ســەری ئەســپەکان کەوت، دڵنیــا بــوو حـاجی مـراد لەوێیە. هێزەکانی ئاگادار کرد و دەوەنجاڕەکەیان گەمـارۆدا. ڕاوەسـتا هەتـا هەوا ڕوونـی بکـات و حـاجی مـراد بە مردوویی یان زیندوویی دەستگیر بکات.

حاجی مراد بۆی دەرکەوت گەمارۆ دراوە. جۆگەیەکی وشکی لە نێو دەونجاڕەکەدا دۆزییەوە. هاوڕێکانی ئاگادار کردەوە کە واباشــە گـڵ و خـۆڵ لە کەنـاری جـۆگەکە هەڵـدەنەوە، بـیکەنە مەتەرێــز و هەتــا دوایــین فیشــەک و دوایــین دڵــۆپی خــوێن بەربەرەکانێ بکەن. هاوڕێکانی دەستیان کرد بە بڕینی بنچک و دەوەن و هەڵکەنــــدنی زەوێ. بە خەنجەرەکانیــــان زەوییــــان هەڵـدەکۆڵی و خۆڵەکەیـان هەڵـدەدایەوە. حـاجی مـراد خۆشـی یارمەتیی دەدان.

کاتێک هەوا ڕوون بۆوە، فەرماندەی سوارەکان چووە سـەر بســتوویەک و دەنگــی هەڵبــڕی: «حــاجی مــراد! خــۆت بــدە بە دەســتەوە! ئـێمە هێزێکــی زۆریــن و گەمارۆمــان داون. دڵنیــابە دەرەقەتمان نایەی. ئێوە شـەش کەسـن و ئێمە هێزەکانمـان زۆر و پۆشتە و پەرداخن.»

لە وەڵامــی فەرمانـدەدا تەقەیەک هــات و بـاقەیەک دووکەڵ لە جــۆگەکەوە هەســتا. گــوللەکە ئەســپی یەکێــک لە چەکــدارە ڕەشـۆکییەکانی گلانـد. پاشــان قرمژنــی گــوللە دەوەنجـاڕەکەی داگـرت و لە هەمـوو لایەکەوە کـازاخ و چەکـدارە ڕەشـۆکییەکان دەوەنجاڕەکەیـان گوللەبـاران کـرد. لە هەمـوو لایەکەوە ویـزەی

گولله دەهات و لق و پەلی دار و دەوەنەکانی دەشکاندەوە و لە گڵی هەڵدراوەی لێواری جۆگەکە دەدرا، بەڵام حاجی مراد و هاوڕێکانی جێگاکەیان ئەمن بوو. تەنیا گوللەیەک لە سەری ئەسپەکەی گەمزالۆ درا، ئەویش سڵەمیبۆوە لە ئەسپەکانی تر دوورکەوتبۆوە. وەک ئەسپی هەوسار پساندوو بە نێو بنچک و دەوەنەکاندا غاریدا و کە گەیشتە لای ئەسپەکانی تربەلادا کەوت و دوای تۆزێ لاقەفرتێ گیانی دەرچوو. خوێنی بە سەر گژوگیای تازە ڕسکاودا ڕژا و سووری هەڵگێڕان. حاجی مراد و هاوڕێیانی، تەنیا کاتێک تەقەیان دەکرد کە یەکێک لە چەکدارەکان وەدیار دەکەوت. کەم وابوو نەیپێکن. سێ کەس لە چەکدارە ڕەشۆکییەکان برینـدار بوون، ئەوان نەک نەیانوێرا هەڵکەوتنە سەر سەنگەری ئەوان بەڵکوو پرنیگانەوە و پاشەکیشێان کرد. جار و بار لە دوورەوە تەقەیان دەکرد.

سەعاتێک بەو شێوەیە تێپەڕی. هەتا و باڵا پیاوێک هاتبووە سەرێ. حاجی مراد لە بیری ئەوەدا بوو خۆی هەڵداتە سەر ئەسپەکەی و خۆی بگەیەنێتە ڕووبارەکە؛ بەڵام هەروا و قرموقاڵی تاقمێک بەرز بۆوە کە دیار بوو تازە گەیشتوونەتە شوێنی تێکهەڵچوونەکە. حاجی ئاغا مەختوولی و چەکدارەکانی بوون. نزیکەی دووسەد کەس بوون. حاجی ئاغا و حاجی مراد هاوڕێی یەک بوون و هەر دووکیان دانیشتووی کوێستان. حاجی ئاغا ماوەیەک بوو چووبووە ڕیزی هێزەکانی ڕووسەوە. کوڕی ئەحمەد خان دوژمنی قەستە سەری حاجی مرادیش لەگەڵیدا بوو.

حاجی ئاغاش وەک کارگانۆڤ سەرەتا داوای لە حاجی مراد کرد خۆی بە دەستەوە بدات. وەڵامی ئەویشیان بە گوللەیەک دایەوە. حاجی مراد فەرمانی دا شمشێرەکانیان هەڵکێشن و خۆشی شمشێرەکەی هەڵکێشا و هاوار و گوڕەی سەدان کەس لە و دۆڵ و دەرەیەدا دەنگی دایەوە. چەکدارە ڕەشۆکییەکان هێرشیان کرد بۆ نێو دەوەنجارەکە. بەڵام لە نێو سەنگەرەکانەوە بەردەوام تەقە دەکرا و سێ کەس لە هێرشکەرەکان کەوتن. هێرشکەرەکان دەوری دەوەنجارەکەیان گرتبوو و تەقەیان دەکرد. بە دەم تەقە کردنەوە لە سەنگەرەکە نزیک دەبوونەوە. چەند کەس بە گەلەی حاجی مراد و هاوڕێکانی پێکران و بوونە قوربانی. حاجی مراد گوللەی بە خەتەر نەدەدا. گەمزالۆش کەم وابوو گوللەی بە خەتەر بچێ. هەموو جارێک کە هێرشکەرێکی دەپێکا، لە خۆشیاندا هاواری دەکرد و شادیی خۆی دەردەبڕی. قوربان لە سەر لێواری سەنگەرەکە دانیشتبوو و بوێرانە و کۆڵنەدەرانە تەقەی دەکرد و گۆرانیی دەگوت؛ زۆربەی گوللەکانی بەخەتەر دەچوون. ئیلدار تووڕە و ئۆقرە لێبڕاو دەیویست دەست بداتە خەنجەرەکەی و هێرش بکاتە سەر هێزەکانی دوژمن، هێندەی ڕق هەستا بوو هەموو گیانی دەلەرزی. چاوی لە سەر حاجی مراد هەڵنەدەگرت. خەنیفەی تیسکن بە قۆڵی هەڵکراوەوە لێرەش ئەرکی نۆکەریی خۆی بەجێ دەهێنا و ئەو تفەنگانەی حاجی مراد و قوربان پێیان دەدا، بە خێرایی پڕی دەکردنەوە. خان محەممەد بە پێچاوانەی هاوڕێکانی لە سەنگەردا نەمایەوە، هەڵات بۆ لای ئەسپەکان بۆ ئەوەی بیانبات بۆ شوێنێکی ئەمنتر.

بەردەوام دەیگوڕاند، بەبێ ئەوەی سێرە بگرێ تەقەی دەکرد. یەکەم کەس بوو پێکرا. گوللەیەک لە ملی درا. دانیشت. دەکۆخی، خوێن بەدەمیدا دەهاتە خوارێ و جنێوی دەدا. حاجی مرادیش دوای ئەوەی پێکرا. گوللەیەک لە شانی درا و هەڵیدڕی. ئاتەگی بەشمیشتەکەی دادڕی و توند برینەکەی بەست. دەستی کردەوە بە تەقە کردن.

بۆ سێهەمین جار ئیلدار هاواری کرد: «با بەشمشێرەوە هێرشیان بکەینە سەر!» سەری هەڵبڕی و ویستی لە سەنگەرەکە بێتە دەرێ، هەر لەو کاتەدا پێکرا و لە بەر دەمی حاجی مراددا تخێڵ بوو. حاجی مراد چاوێکی لێکرد. چاوە جوانەکانی بە شێوەیەکی ئاشقانە لە حاجی مراد بڕیبوو. دەمی کۆ کردبۆوە و لێوی سەرەوەی وەک لێوی خونچەی منداڵان دەچوو، بێ ئەوەی بکرێتەوە دەجووڵایەوە و دەتگوت بە دەم خەوەوە مەمکی دایکی دەمژێ. کەوتبوو بە سەر لاقی حاجی مراددا، لاقی لە ژێر تەرمەکەی ئیلدار دەرهێنایەوە و دەستی کردەوە بە تەقەکردن. خەنیفە بە سەر تەرمەکەی ئیلداردا نووشتایەوە گوللەکانی نێو فیشەکلغەکەی دەرهێنا و کردیە گیرفانی خۆیەوە. قوربان بێ ئەوەی مێشێکی میوان بێ تفەنگەکەی پڕ دەکردەوە و گۆرانیی دەگوت و تەقەی دەکرد.

هێزەکانی دوژمن هاتوهاواریان ساز کرد بوو، دەون بە دەوەن دەهاتنە پێشێ و نزیک دەبوونەوە. گوللەیەکی تر لە قەبرغەی چەپی حاجی مراد درا. لە نێو جۆگەلەکەدا خۆی درێژ کرد. دەستماڵکێکی تری لە ئاتەگی بەشیمیتەکەی دادڕی و لە زارکی برینەکەی ئاخنی. هەستی کرد خەریکە دەمرێ. چونکە

ئەو برینەی لاکەلەکەی زۆر قورس و کاری بوو. بیرەوەری و خەیاڵەکانی ڕابردوو یەک بە دوای یەکدا و بە پڕتاو بەزەینیدا تێدەپەڕین و لێی دوور دەکەوتنەوە. ئەبوو نۆتسال خانی پاڵەوانی دەدی خەنجەری بە دەستێکەوە گرتووە و بە دەستەکەی دیکەی ڕوومەتە هەڵدڕاوەکەی گرتووە و هێرش دەکاتە سەر دوژمن؛ پاشان ڕوخساری زەردەڵ و چرچولۆچی ڤۆرۆنتسۆڤی پیر بە زەینیدا هات، دەتگوت پیرە ڕێوییەکی فێڵەبازە. پاشان یۆسفی کوڕی و سوونیای ژنی، هەر وەها دەموچاوی ڕەنگ بزرکاو و دڕی دوژمنەکەی، واتە شامیلی دەدی بە ڕیشی سوور و چاوی نیوەقووچاوەوە.

هەموو ئەو وێنە خەیاڵییانە بە زەینیدا تێدەپەڕین و بە هیچ شێوەیەک هەستیان نەدەجووڵاند. نە داخ و حەسرەت، نە تووڕەیی، نە تامەزرۆیی. هەموو ئەوانە لە هەمبەر ئەم ڕووداوەی ئەمڕۆ و ئەو هەستەی ئێستا لە ناخیدا سەری هەڵدا، یان پێشتر سەریان هەڵدابوو، زۆر هیچ و بێ بایەخی دەنواند. جەستە بە هێز و پڕ تواناکەی، خەریکی درێژە پێدانی ئەو کارە بوو کەوا دەستی پێکردبوو.

دوایین وزە و هێزی خۆی کۆ کردەوە. لە نێو سەنگەرەکەیدا هەستایە سەر پێ و شەشلوولەکەی نا بە سنیگی ئەو پیاوە هێرشکەرەوە کە چەند هەنگاوی مابوو بگاتە سەری و تخێڵی کرد. حاجی مراد دەست بە خەنجەر لە سەنگەرەکەی هاتە دەرێ و بە شەلە شەل هێرشی کردە سەر دوژمنەکانی. چەند گوللەیان پێوەنا. حاجی مراد کەوت و تلۆر بۆوە نێو مەتەرێزەکە. چەند کەس لە چەکدارە ڕەشۆکییەکان هاواری

شـــادییان دەربـــڕی و هۆمەنیـــان بـــرد بـــۆ جەســـتە لە خـــوێن گەوزیـــوەکەی. بەڵام ئەو تەرمەکەی کە پێیـــان وابـــوو ســـارد بۆتەوە، لە ناکاو جووڵایەوە. سەرەتا سەری ڕووت و خوێناوی و تاشـــراوی بەرز کـــردەوە؛ پاشـــان دەســـتی بە ســـاقەتەی دەرختێکەوە گرت و هەموو ئەندامی وەک پەیکەرەیەکی قایم و شـــەلاڵی خـــوێن بە پێـــوە ڕاوەســـتا. هێنـــدە ترســـناک بـــوو هێرشکەرەکان لە جێی خۆیان ویشک بوون. لە ناکاو تەرمەکە لەرزیـــیەوە و دەمەڕوو کەوت؛ تەرمـــی ڕاکشـــاوی دەتگـــوت قانگەلاشکی تەڕە کەوتۆتە بەر گەوزی مەڵەغان و ئێتر جووڵەی لێبڕا.

نەدەجووڵایەوە، بەڵام هێشتا گیانی لە لەشدا بوو.

حـــاجی ئاغـــا لە پـــێش ئەوانـــی دیـــکەوە گەیشـــتە ســـەری و بەخەنـــجەرە گەورەکەی لە ســـەری ڕاکێشـــا. حـــاجی مـــراد پێـــی وابوو بە کوتک کێشایان بە سەریدا، نەیدەزانی کێ لێیدا و بۆ؟ ئەوە دوایـین هەسـت بـوو لە جەسـتەیدا. ئێتـر هەسـتی بە هـیچ نەکرد. دوژمنەکانی جەستەیەکی لە خوێندا شەلاڵ و دابێژدابێژ کراویان دابووە بەر پێلاقە و شمشێر کە ئێتر هیچ پێوەندییەکی بە حاجی مرادەوە نەبوو.

حـــاجی ئاغـــا لاقـــی لە ســـەر پشـــتی تەرمەکە دانـــا و بە دوو زەبـری شمشـێر سـەری لێکـردەوە. بە نـووکی لاقـی و زۆر بە پـارێزەوە بـۆ ئەوەی پۆسـتاڵەکانی خوێناوی نەبـن تلانـدی و لە تەرمەکەی دوور خستەوە. خوێنی گەش لە شادەمارەکانی ملی تەرمەکەوە فیچقەی دەکرد، کەللەسەرەکەش خوێنی ڕەشی لێ دەچۆڕا و گیاوگژەکانی دەخووساند.

کارگانۆڤ و حاجی ئاغا و ئەحمەد خان و هەموو چەکدارە ڕەشۆکییەکان وەک ئەو ڕاوچییانەی چەند ئاژەڵیان کوشتبێ، لە دەوری تەرمەکەی حاجی مراد و هاوڕێیانی کۆ بوونەوە و لە نێـــو ئەو دووکەڵ و بـــۆنی بـــاڕووتەدا کە دەوەنجـــاڕەکەی داگرتبوو، سەر کەوتنی خۆیان کردە جێژن و هەروا هاواری شادییان وەڕێخست.

بولبولەکانی نێو دەوەنجاڕەکە هەتا ئەو کاتەی تەقە کردن درێـژەی هەبوو، بێدەنگ بوون، پاشان دەستیان کردەوە بە خوێندن، سەرەتا یەکیان لە نزیکەوە، پاشان ئەوانەی دوورتر بوون.

***

قانگەلاشـــکی تەڕ کە بە گـــوڵە بنەوشـــەکانییەوە لە نێـــو شێوەردەکەدا پێشێل کرابوو، ئەو مەرگەی دڵتەزینەی وەبیر هێنامەوە.

.........................................

سەرچاوە: حاجی مراد، اثر لئوتولستوی، ترجمەی همایون صنعتیزادە، چاپی اول. ١٠٩٠ تهران انتشارات کتاب پنجرە.

## فەرهەنگۆک

ئاخێزگە: سەرچاوە.
ئاخێز کردن: هەستان، کێل بونەوە.
پاچڤە: وەرگێڕان. (ترجمە)
چپڕ: چڕوپڕ، دارستانی چڕ. (جنگل انبوە)
چێنک: مێرگ،سەوزەڵانی. (مرغزار)
تووتەک: ک.نەبوو، تاقتاقکەرە. (بوم)
تەربیع: چونیەتیی جێگیر بوونی مانگ لە دوو قۆناخی خۆیدا (شەوی حەوتەم وشەوی بیست و یەکەمی مانگی کۆچی) بەرانبەر بە زەوی. (تربیع)
جەندەک: کەلاک، لاشە، تەرم. (لاشە)
چلدرۆ: بریتی لە کەسێک کە درۆ زۆر دەکات.
چێنک: مێرگ، چیمەن. (مرغزار)
چەنەوێرغە: بریتی لە چەقەسرۆیی، زۆربڵەیی. (کنایە از حرافی زیاد)
خاپینۆک: فریودەر، کڵاوچی، فێڵەباز. (حقە باز)
خاکەڕا: خۆ بەکەم زان. (متواضع)
زوورە: بەردێکی زبرە چەقۆ و خەنجەرو... هتدی پێ تیژ دەکەن. (سنگ سوهان)
سەلکەبزووت: چوومەت، داری نیوەسووتاو. سەرەبزووت.

سێسوو: بڕبەند،موورەت. (سوهان)
شووتە: هۆڕنی وریاکەرەوە (ئاژیر)
شیروشەپاڵ: بەیبوون. (بابونە)
فحێل: بخشراو. (تبرئە)
قانگەلاشک: درووی کەنگر. (گل گنگر)
قورساخ: بە ویقار. (با وقار)
قیڕات: گەرماپێو. (دماسنج)
کاتۆر: زەویی ڕووتەن و بێ داروگیا.
کاشە: خێشکی سەر بەفر. (سورتمە)
کۆلاس: چەخماخە. (گلنگدن)
کۆماج: بوغاری، کوانووی نێو دیوار. (شومینە)
کوڵەباڵ: پەستەک، هێلەگ. (نیم تنە)
کەرکە: عەبا، کەوای درێژ. (ردا)
کەڵپۆس: باڵتۆی کەوڵی ئاژەڵ. (پوستین)
گتگرتن: تۆزە ڕاوەستان.(مکث)
گەزیچار: دارێکی خۆڕسکی قەراغ چۆمە و شووڵ باریکەکانی دەگەن بە گەسک.
ماریز: ماڕز، زاڵم، دیکتاتۆر.
مدریک: زیرەک، وریا. (زیرک)
نشووک: تووتنی زۆر کوتراوی تاڵەبێژکراو کە هێندێ کەس دەیکەنخە لووتیانەوە. (انفیە)
نشوک دان: توتن دان. (انفیەدان)
هەنتەش: حوزوور.

## بەرهەمەکانی ئەمین گەردیگلانی

1) تاپۆی وەرزێکی سەوز، کۆمەڵەشیعر، چاپخانەی شوعاع تەورێز، ۱۹۹۷.
2) شەوەژانی ئەستێرەیەک، کۆمەڵەشیعر، تاران، نشر عابد، ۲۰۰۰.
3) مەرگەخەون، کۆمەڵەشیعر، تاران، نشر پیام امروز، ۲۰۰۳
4) دیسان لەو شەقامانەوە، کۆمەڵە چیرۆکی بیژەنی نەجدی، وەرگێڕان، ئاراس، ۲۰۰۳ هەولێر
5) تەپڵی ئاور، کۆمەڵە چیرۆکی بیانی، وەرگێڕان، ئاراس، ۲۰۰۵ هەولێر
6) جێگای بەتاڵی سلووچ، ڕۆمان، مەحموودی دەوڵەتئابادی، وەرگێڕان، موکریانی، هەولێر ۲۰۰٦
7) خۆر و لاولاو، کۆمەڵە شیعری منداڵان، بۆکان، چاپخانەی داهاتوو ۲۰۰۷.
8) یەکگرتن، چیرۆکی منداڵان، قودسی قازی نوور، وەرگێڕان، ئاراس، ۲۰۰۷ هەولێر
9) برایانی کارامازۆف، ڕۆمان، فیۆدۆر دۆستۆیۆفسکی، وەرگێڕان، موکریانی، هەولێر ۲۰۰۷
10) خولیای نووسین، کۆمەڵە وتار_ ڕەزا بەراهەنی، وەرگێڕان. موکریانی، هەولێر ۲۰۰۸.
11) فەرهەنگی ڕێژگە (ئەو وشانەی لە هەنبانە بۆرینەدا نەهاتوون)، موکریانی هەولێر ۲۰۰۹
12) کەڵەشێری ورگن، چیرۆکی منداڵان، فۆلکلۆر؛ نووسینەوە، بۆکان، ئیزیرتوو، ۲۰۰۹

13) تازیەبارانی بەیەل، ڕۆمانی غوڵامحوسێن ساعیدی، وەرگێڕان، موکریانی٢٠١١ هەولێر
14) مەرگی ئیڤان، ڕۆمان، لیۆ تۆلستۆی، وەرگێڕان، موکریانی، هەولێر ٢٠١١
15) دار وپەپوولە و ڕووبار، چیرۆکی منداڵان، فەریدە شەبانفەر، وەرگێڕان، ٢٠١١
16) دیلی قەفقاز، ڕۆمان، لیۆ تۆلستۆی، وەرگێڕان، موکریانی، هەولێر ٢٠١١
17) باوکە سێرگی، ڕۆمان، لیۆ تۆلستۆی، وەرگێڕان، موکریانی، هەولێر ٢٠١١
18) ئاغا و نۆکەر، ڕۆمان، لیۆ تۆلستۆی، وەرگێڕان، موکریانی، هەولێر ٢٠١١
19) هاوسەرگیری بەختەوەرانە، ڕۆمان، لیۆ تۆلستۆی، وەرگێڕان، هەولێر، خانەی کتێبی ئاوێر ٢٠١٢
20) نارنجی فڕین، کۆچیرۆک، وەزارەتی ڕۆشنبیری، سلێمانی، ٢٠١٢
21) ئانا کارنینا، ڕۆمان، لیۆ تۆلستۆی، وەرگێڕان، موکریانی، هەولێر
22)سترانی شەپۆلەکان، شێعری هاوچەرخی فارس، وەرگێڕان. یەکیەتیی نووسەران مەڵبەندی گشتی، هەولێر.
23) شنەی پشکووتن، دیوانی شیعر ناوەندی بڵاوکردنەوەی کۆڵەپشتی، تاران ٢٠١٣

**ئەم بەرهەمانەش ئامادەی چاپن:**

1) کازاخەکان، ڕۆمان، لیۆ تۆلستۆی، وەرگێڕان

2) ڕێگایەک بەرەو هەتاو، کۆمەڵەچیرۆک، وەرگێڕان

3) شارەزاییە بنەڕەتییەکانی ژیان، دووررووتی ڕیچ، وەرگێڕان

4) شەیتان، ڕۆمان، لیۆ تولستوی، وەرگێڕان

5) سۆناتای کرۆیتیزێر، ڕۆمان، لیۆ تولستوی، وەرگێڕان

6) پۆلیکۆشکا، ڕۆمان، لیۆ تولستوی، وەرگێڕان

7) پەسلان، ڕۆمان، لیۆ تولستوی، وەرگێڕان